# شیری مایــن

نووسینی : یەشار کەمال
شوکور مستەفا
کردوویە بە کوردی

مرۆ ئاگری لەشتکۆڵینەوەو ڕازهــەڵینانو هــەر کە هەلیشــیهێنــا لەخۆشییان وەك شێت لێ هاتنێکی ـ تێدایە ٠

ئێمە کە بە دیداری ئەم دنیای ئەمڕۆمانە شادوشوکور بووینەتەوە ، هەموو لە سای سەری ئەم ئاگرەوەیە ٠ لە سای سەری هێزو گوڕی ئەم ئاگرەوەیە کە ئاڵقەلەگوێی فەرمانان نیە ٠

بەڵام مرۆ هێندێ لایەنی دژ بەو ئاگرە پیرۆزەیشی تێدایە ، بەڵای خودام لێدا ، زۆر بڵحە ٠ ئەملایەنەی تێــدان ، بوون بــە سندمــی دەستوپێی ٠ بۆ شکاندنی ئەم سندمەیش ڕەنجێکی زۆری بەباداوە ٠ ئەم سندمە نەبوایە ، مرۆ لە شەڕو شۆڕشی داهێناندا ، لە ڕازهەڵێناندا، بەگژ ئەو چەڵەمانەی لە پێی ئالاوون ، چووبا ، لەوانەبوو دنیا شتیکیتر بوایەو ئەم شوێنەی پێیدەڵێن مانگ زۆر زووتری پێگەیشتبا ٠

مرۆ ساڵەهای ساڵ بە لاسو پەلاسدا دەچێ ، شەڕدەکا ، تــا یاساو دۆزێ پێکەوە دەنێ ٠ دامەزراندنــی ئەو یاســاو دۆزە ساڵەهای

سالی دەوێ • ئەمە کارێکی چاك نیە ؟ زۆر چاکە • لەپاش ماوەیەك ئەو یاساو دۆزە کۆن‌دەبـێ ، دەوری بەسەردەچـێ • کە یاسـاو دۆز کۆن‌بوو ، جاڕکێشانی یاساو دۆزی تازە ، شۆڕشگێڕانی یاساو دۆزێکی نوێباو دەست بە دەرکە لە تەپان‌و گرێژەنە دەرێنان دەکـەن • لەنێـو خۆیاندا بەشەڕدێن ، یاسـاو دۆز پەروەرانـی کۆن دەبـەزن ، بەڵام لەپاش‌چی ••• لەپاش ئەوەی کاری زۆر چاکیان لەدەست‌دەچی •••

ئینسانانی ئەو شوێنەی پێی‌دەڵێن ڕۆژاوا گورج‌وگۆڵانەتر وەخەبەر هاتوون• گوتوویانە ئێمە خەریکی چین ؟ یانێ چی بەپاشەوە نووساوین، هۆ هۆ ئینسانینە لە هەر ڕازهەڵێنانێکی تازە ، لە هەر بیرو ئەندێشەیەکی نوێ چاکەو خێروبێرێکی گەورەو زۆرو زەوەندەمان بەگیردەکەوێ • ئەوانەی لە هەموو ڕوویەکەوە داکۆکی لـە بـیرو ئەندێشـەی نرت‌ونـوێ دەکەن زۆربوونەتەوە • جا ڕۆژاوا لـە هەموو مەیدانێـکدا پێشکەوتووەو بـەرەو پێشەوە دەڕوا •••

مرۆ هەر هێندە لە بیروبڕوای پێوە قاڵب‌گرتوو بەدەر نەختۆکەیێ ، بیری‌کردبێتەوە کاری‌کراوە ••• ئەدی چەرمیان نەگورووە ، چاویـــان دەرنەهێناوە ، چی‌وچی‌یان لێ نەکردووە • هەر بۆئەوەی نەبادا داهێنانێکی نوێباو ، بیرێکی تازە لە کەئێنێکەوە بەناو وڵاتەکەیاندا بتەنێتەوە ، پێکدا هەڵبڕژاوون ، بە لاس‌و پەڵاسدا چوون ، چونکە بیری نوێ ، ڕازهەڵێنانی نوێ، یاساو دۆزی کۆنیان ژێروژوور دەکا ، سەراسوودەیی بڕێ ئینسان دەشێوێنێ • کار لەوەش خراتری لێ هاتووە • یاساودۆزیان وا شێواوە ، بەڵام چ شێوانێ ! ئەو ئینسانە ڕۆژاوایی‌یانەی کە بە کۆڵێ داهێنانی نوێ‌و بیری نوێ‌وە هاتوون، وردو باریك ئەوانیان‌کردووە بە بەندەی ئاڵقەلەگوێی خۆیان • ئێمە بە هێنـدێ جـۆرە سەرو مێشـکمان گوت سەرو مێشـکی

ڕۆژهەڵات • گوتیشمان هەی بە بڕین چێ • جا ئەم سەرو مێشکە بە بڕین چووە ، لەپێشان هەرچی داهێنانێکی تازە ، ڕۆژاوا دایهێنا لەگژی ڕاچوو • نزیکەی سەد ساڵێ بەگژیداچوو • ڕۆژاواییەکان ئەم تازە ئیجاتانەیان ، چ بە زۆر چ بە خوایشت ، بە هەرجۆرێ بوو بە لالوێچێ ڕووناکبیری وڵاتە ڕۆژهەڵاتەکان سەلماند • ئەوانیش تەماشایان کرد ، خراپ نیە • یاساو دۆزەکە نەختۆکەیێ شیرازەی تێك چوو ، بەڵام کەمۆکەیێ • ئەوەندکۆکە عەیبە لە کیژی قازی یش دەگیرێ • سواری شەمەندەفەر بوون ، سواری پاپۆڕ بوون ، سواری فڕۆکە بوون ••• بە دیداری کارەبایش گەیشتن • ڕۆژاوا ئەو هەمووەی پێ بەخشین • کەچی ئەوان هەر لێی بەلاداکەوتوونو لە خرپەی خەودان •

ڕۆژاوا ئێستاکە وا بەدووای کاروبارەوەیە • وا شۆڕشێکی تر هەڵدەگیرسێنێ : ئاتۆم دروستدەکا ، یەك • خۆی بۆ چوونە سەرمانگ ئامادەدەکا ، دوو • شتێکی تر دەکا (١) ، ئەمە لە هەمووی گرنگترە : دژ بە مرۆ بەدەست مرۆ چەوسانەوە ملی لە شۆڕشێکی بەسام ناوە •

ئینسانانی بەرەی هێزی پێشکەوتەی ئەم شۆڕشە بەسامە هەموو ڕۆژێ شتێ پتریان وەچەنگ دەکەوێ ، بەڵام سەرو مێشکە ڕۆژهەڵاتی یەکە ، بە بڕین چێ ، هەر بۆئەوەی ، نەوەکا یاساو دۆزەکە کەلێنێکی تێکەوێ ، گیانی خۆی بۆ بەختدەکاو لەدژی گۆڕانەکەیە•••

ئینسانانی ڕۆژهەڵات برسی ، ڕووت ، پەرێشان ، بۆ پاروویەك خۆیان بە دارو بەردداد دەدەن ••••

---

«١» ئەم وتارە لە ١٩٦٢/٢/٢٨ دا بڵاوکراووتەوە . • « وەرگێڕ »

بڕوانن برسێتی لەم ئەنەدۆڵە ڕۆژهەڵاتەدا چکارێ دەکا • هی‌وا هەن ، دەڵێن بە پیتاكو باربووكردن بەری‌لێ‌دەگرین • من هەر لەئێستاوە پێتان‌دەڵێم • ئەنەدۆڵ وا بڕوا ، خەڵكەكە لەگەڵ ئەم برسێتی‌یەدا ساڵەهای ساڵ دەستەوبەرۆك دەوەستن •••

مێشكی رۆژهەڵات چارەسەرێ بۆ ئەمە نادۆزێتەوە • لە چارەسەر گەڕان، چارەسەر دۆزینەوە دەبێتە بەهای سەری شێوانو هەرەس‌هێنانی پاساودۆزی ئەمڕۆكە • خۆ مێشكی ڕۆژهەڵاتیش ناشكوری نەبێ هەروا لەخۆیەوە پاساو دۆز ناشێوێنێ ••• شەقڵو مۆری ناشكێنێ •• دەبا نەیشێوێنێ ، پیاو • من خۆم لەقەرەی ئەو لایەنەی نادەم • جا وڵاتەكەی ئێمەیش وا لەم‌بارەداو دەستەیێ كۆنەپەرست ، كە گۆیا میللی‌یەتچی ، توورانچی ، مقدساتچی‌یان پێ دەڵێن ، بەپەدابوون •

ئەمانە چبڵێن باشە ؟ ئێمە ڕەگەزپەرستین ، میللی‌یەتچین • چاكە، خاسە ، بڕۆن ببن • كارێكی لەبارە • ڕەگەزی تورك لەسەررووی هەموو ڕەزەكانەوەیە • سەردەمانێ ئەمەیان بەتەك گورگە دەم‌داپچڕلوەكەوە لەسەر بەرگی كۆواران دەنووسی • ڕەگەزی تورك لە سەرووی هەموو ڕەگەزەكانەوەیە ، نیە ، ئەوە نازانم • پیاوانی زانست ئەم كاری ڕەگەزپەرستی‌یەیان كرد بە دۆو دۆشاو • پەڕو باڵی پێشكەوتیان پێوە نەهێشت • ئێستا ئەم ئینسانانە ، سەرباریش ، دەڵێن ، ئێمە موسوڵمانین ، مقدەساتچین • لە موسوڵمانەتیدا هیچ موسوڵمانێ لە سەرووی هیچ موسوڵمانێكی‌ترەوە نیە • سەرلەبەری موسوڵمانان ، لە هەر ڕەگەزێ بن ، بران •

كەواتا ئەمانە یا ڕەگەزپەرست نین ، یا موسوڵمان نین • ئەمانە درۆزنن • ئەمانە ئەو كۆنەپەرستانەن كە پاشكەوتەیی میللەتیان دەوێ ،

بۆ سوودی خۆیان ، نەشێوانی یاساو دۆزیان دەوێ • ئەمانە لەگەڵ ئەو ئاغایانەشدا کە لەدژی یاساو دۆز شێوانن یەکیان گرتووە ، ئەمانە هەر ئەوکەسانەن کە لەدژی شۆڕشی ڕزگاری دەستیان لەگەڵ دژمندا تێکەڵ کرد •

شازدە حەڤدە ساڵان بووم ، سەردەمێ شیعرم دەنووسی توورانچی ، ڕەگەزپەرست ، میللی یەتچی چبوو سەرەودەرەم لێ دەرنەدەکرد • قوتابخانەکەشمان بزاوتێکی توورانچیێتیی ئاواوایی تێدا هەبوو •••

توورانچی یەکان بە دووجۆر کاریان دەکرد : بە منداڵە هەژارەکانیان دەگوت ، تەماشای ئەم دەوڵەمەندانە بکەن ، تەماشای کۆشك و تەلارو ئەپارتمانیان بکەن سەیری کێلگەو بەرەجووتەکانیان بکەن و ئاوڕێکی ژیرانەیش لە حاڵی خۆتان بدەنەوە ••• منداڵە هەژارەکان دڵیان دەچوونێ • هەرچی منداڵە دەوڵەمەندەکانیش بوون پێیان دەگوتن ، هاوڕێینە ، تەماشاکەن لە دەرەوە میلیۆنەها هاوڕەگەزی برسی و ڕەش و ڕووتمان هەن ، با ڕزگاریان کەین • لەمەش پێوە هاش و هووش و پرۆپاگەندەشیان بۆ سایەچەوریی دەواری ڕەش و قمزو تیرو کەوان و شەڕو خوێن ڕشتن دەکرد دەیانگوت ، نێر ئەوکەسەیە شەڕی بوێ ، مەردی کوڕی مەرد ئەوکەسەیە لە شەڕدا بمرێ • دۆڵیان دۆڵیان خوێن ، خوڕخوڕ خوێن •• سەرلەبەری شیعری کۆوارە گورگ دەمداپچڕیوەکانی ئەو سەردەمە خوڕخوڕ خوێناوی بوون ، خوێنیان لێ دەتکا • ئەوی شەڕی نەویستبا غایەنی نیشتمان بوو •

من ئەودەمی زمانم سووتا باسی «زەوی»م کرد ، گوتم دەوڵەمەندەکان زەوی وزاریان زۆرە • ئێمە نیوەکارین • زەوی وزارمان نیە • چیم بە خۆم کرد • پولیس کارێکیان بێ کردم با بە دەواری شڕی ناکا • لە هاتوچۆو

چوونە ناوخەڵك كەوتم • هێندەی نەما بمكوژن • بەڵام كەس نەبوو بە توورانچی‌یەك بڵێ ، برۆ بە سەرچاوتەوەیە • كۆوارەكانیان لە قوتابخانە سەرەتایی‌یەكاندا بەهۆی مامۆستاكانەوە بە فرۆتن دەدا • ئێستاكانێ چەندیان ڕوودەدرێتێ ئەوسایش ئاوهایان ڕوو دەدرایێ •

ئەو سەردەمە شیعریشم نووسی • شیعرەكانم نیوە دێڕێكی لەم بابەتەی تێدابوو ! « ئاڵایەكی سپی لەسەر خەون‌و خولیاكانم هەڵكەن ••• »

كاكە زاریان لێ داپچڕیم ، وەكو گورگی هار هاشاوڵیان بۆ هێنام : توركێ تورك بێ دەم لە ئاڵای سپی‌یەوە دەدا ؟ سپی هامانا ، ئاشتی ، ئەوەی خۆی بە تورك بزانێ قەت ئاشتیی دەوێ ! كە گوتت تورك ، واتە خوێن •

ئێمە ئەو سەردەمانە زۆر لەو كارانە نەدەگەیشتین • جگە لەمەیش، كاكە باس هەر باسی « قمز » بوو • قمز واو شێلە وا •••

پێنج شەش هاوڕێ ، لە پەنایەكەوە سەرمان بەیەكدا گرت ئاخۆ ئەمقمزە چی بێ ؟ قمز پیاو مەستدەكا • هالەباش چەندو چەند ڕازەكەمان هەڵێنا: كە جۆرە شەرابێكە لە شیری ماین دەگیرێتەوە • یەكێ لەوانەی ئەقڵی لەسەردا هەبوو گوتی ، ئێستا بەدەست‌ناكەوێ • بۆ ئاسیای ناوەندیش بچن هەر نیە • خەڵك ئیتر شەرابی‌وا ناخۆنەوە • قمزخواردنەوە ناچاری‌یەك بوو سەردەمی بەسەر پشتی ئەسپ‌و ماینەوە گەڕان دایهێنابوو• ئیتر هەرچی‌یەك بوو ، دەبێ شەرابێكی زۆر خراپ بووبێ •••

ئیتر هەر بەجارێ وڕوگێژی كردین ••• شەرابی زۆر خرابی قمز ••• خۆڕخوڕ خوێن ••• دەوجا وەرە ، ئەنەدۆڵ بەم برسێتی‌و پەرێشانی‌یەی خۆیەوە ، هەرئەوەی ماوە ، بە تیرو كەوانەوە بۆ سەفەری ئاسیای ناوەند بەڕێ‌كەوێ •••

نووسینەکەم درێژای کێشا ، دەمەوێ بڵێم ، ئینسان شتی نوێباوی بە زۆر سەلماندووە • زۆر جاران لە بیرو ئەندیشـەی نـوێ دوورەوپەرێز وەستاوەو بە ئامان‌و زەمان توخنی نەکەوتووە ، بگرە بە چاوی دژمنایەتیش سەیری کردووە •

ئێمە ، منداڵی شازدە ، حەڤدە ساڵە ، هەر ئەوەندە نەختێ بیرمان کردەوە ، تێگەیشتین قمز شەرابێکی سەروبەند بەسەرچووە ، نە پیرۆزەو نە تەڕەماش • خوڕخوڕ خوێن‌ڕشتنی ئینسان کارێکی بڵج‌و بوغرنجە •

ئەنەدۆڵ بەم ڕەزیلی‌و سەفیلی‌و برسێتی‌و پەرێشانی‌یەوە ، هەڵتەك هەڵتەك ، بە تیرو کەوانەوە چی لە سەفەری ئاسیای ناوەند داوە •

مرۆ هەر ئەوەند فێری بیرکردنەوە ببوایە ••• چونکە کۆنەپەرستەکان هەمیشە لە هەڵپەو هەڵوەدای ئەوەدان نەهێڵن فێرە بیرکردنەوە ببێ •

# دوو تێکستە شیعری نەمر

**مەحمــوود زامــدار**

گەڕانو سووڕانەوەو پشکنینی بەردەوامو پڕ لەعیشقو عــەودالّ بوونی گەنجینەی زیندووی کورد ، خۆی لە خۆی‌دا ، باری سەرنجێکی قووڵو بەپێزی هەردوو موعادەلەی ڕەسەنایەتی‌و هاوچەرخێتی‌یە .. بۆ ئێمەش کۆنە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی سی ساڵەی یــەکەمی ئەم ســەدەیەو بەرهەمی بەنرخو نەمری وەچەی ڕابەری ڕۆشــنبیری کوردی ـ کـە بەڕاستی ڕابەر بوون ـ کورتترین ڕێچکەو باشترین بەڵگەو دەمڕاستێکە، ئەوەی ئەیەوێ بەمیهرو سۆزی پاکی ( کوردایەتی ) بلاّلێتەوەو پتر ڕەگ داکوتێ‌و ببێ بە (کورد !) و بە ( نووســەی کورد ! » و کوڵكو مووی گــەلێ رازو نیازی ســەیر ســەیری بۆ بکرێتــەوە ، ئــەبێ بــەوردی‌و بەسەوداسەری‌یەوە ، ئاوڕ لەو سەرچاوانــە بداتــەوەو تێرتێر لەبــەری رِوونی ئەو کانیاوەدا تینوێتی خۆی دامرکێنێ‌و سەرخەوێ بشکێنێ ... لەم سەرشارەوە ، هەر بۆ نموونەو چیتر ، وا ئەم دوو تێکستە بایەخدارە ئەخەمە بەرچاو ، تا بەقووڵی لە سەرجــەمی بزوتنــەوەی رۆشــنبیری‌و ڕامیاری‌و بگرە شارستانی ئەو سەردەمەی کورد بگەین ... !!

لە ژمارە ( ٩ )ی گۆڤاری ( کوردستان ) کە بە تورکی‌و کوردی

له ساڵی ( ١٩١٦ ) دا دەرچوە ، قەسیدەیەکی بەنرخی شێخ سلێمانی خالیدی سعێرتی بەناوی ( ڤینا وەتەن ) بلاّوکراوەتەوە ئەڵێ :

حەمدو سەنای ئینس‌و جان
بۆ خالیقی کەون‌و مەکان
سی‌یەما ئەڤ نەوعی ئینسان
دایە ژێرا عەقڵ‌و لیسان
حوببی وەڵات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان •• ئاە کوردستان

★ ★ ★

چەقاس سەلات‌و هەم سەلام
ئەو بت لسەر خەیرولئەنام
هەم ئال‌و ئەسحابی کیرام
ئەون ڕوکنا دینی ئیسلام
حوببی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان •• ئاە کوردستان

★ ★ ★

گۆە بدەن ڤێ حیکایەتێ
گەلی بران ، دا قیسەتێ
ژوەرا بکەم ، بـ حیرقەتێ
لە ڕابو ، قیامەتێ
حوببی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان •• ئاە کوردستان

★ ★ ★

پێغەمبەر ئەو کریە فەرمان
( حب الوطن من الایمان )
عاشق بین گەلی کوردان
ژ بۆ وەتەن ، ژ بۆ زۆزان
حوببی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان •• ئاە کوردستان

★ ★ ★

کەسێ حوببا وەتەن نەکەت
نیعمەتا خۆە ، زائیل دکەت
ئایەت وەسان حوکم دکەت
ژ بۆ خۆڕا مەحرووم دەکەت
حوببی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان •• ئاە کوردستان

★ ★ ★

کوردی ئەگەر مەنسووب بت
( بالغیره ) خۆ ، مەلعوون دبت
بنەسی حەدیس ئیسپات دبت
بێباب‌و بێقیمەت دبت
حوببی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان •• ئاە کوردستان

★ ★ ★

حوببی وەلات ژ ئیمانە
( علی الخصوص ) کوردستانە

مەنبەعی عیلمو عیرفانە
ئەو ژ مەڕا سەر میانە
حوببی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان .. ئاە کوردستان

★ ★ ★

هەرچی وەلات وەك شەکرا
حال زۆزان شیرینترا
ئەو شیرو ماست زەحف خۆشترا
دا ئەم بچن بابو برا
حوببی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان .. ئاە کوردستان

★ ★ ★

عەشقا وەلات ، دل شەوتاند
جانوجگەر ئەو پەرتاند
هەم عەقڵو سەبر ، ما ڕفاند
قووەتێ ما تەمام ستاند
حوببی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان .. ئاە کوردستان

★ ★ ★

سەد ئاە ژ دەستێ فیرقەتێ
سەد ئۆخ ژ بەر ڤێ هیجرەتێ
حەتا کەنگی ڤێ غوربەتێ
دا ئەم بچن ، نیڤ میللەتێ

حوبی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان •• ئاە کوردستان

★ ★ ★

هەرکەس وەلات ناحوبینا
یەقین عەقلی وی چنینا
بئال پێغەمبەر مەقبول نینا
حەمیەت ژێرا ، قەت نینا
حوبی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان •• ئاە کوردستان

★ ★ ★

کانی وەلات باب‌و برا
کانی شەمعا ، دلی مەرا
ئەوە نەعیمی ئەکبەرا
دائەم بچن وێ کیفیرا
حوبی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان •• ئاە کوردستان

★ ★ ★

وەڵاتێ مە ، گول‌و ڕەیحان
ژێ تێتن هەر بیهنا جینان
ئەم پێ‌بوونە ، مەست‌و سەکران
حەتا ئەبەد ، ئاخر زەمان
حوبی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان •• ئاە کوردستان

★ ★ ★

ئەڤ گوتنێ سلێمانە
ژ نەسلا ، خالیدیانە
ساحیب دەردا بێ دەرمانە
قەسەم دکەم ب قورئانە
حوببی وەلات ژ ئیمانە
ئاە کوردستان .. ئاە کوردستان

لە ژمارە (٧)ی هەر ئەو گۆڤارە شیرینەدا خەبەرێك بە ( تورکی ! ) بڵاوکراوەتەوە ، ئەڵێ :

« نوێنەری ڕاسپێرراوی کورد ( شەریف پاشا ) لەلایەن سەرۆکی ئەمەریکا ( ویلسن )ەوە ، لەپاریس پێشوازی لێکراوەو بەنوێنەرو دەمڕاستی کورد پەسەندکراوە .. شەریف پاشاش ، داخوازی‌یەکانی کوردی بە دوورو درێژی بۆ کۆنفرانسی سیڤەر ڕوون کردوەتەوە ... »

خەبەرەکەوا ..!! کەچی لە ژمارە (١٤)ی هەرهەمان گۆڤاردا ، قەسیدەیەکی یەجگار بەکەف‌وکوڵو بەسۆزی شاعیرێکی بەناو ( ئیبراهیمی پێنجوینی !) کە نازناوەکەی ( بابا دەروێش )ە ، بە ناوونیشانی (بۆ جەنابی شەریف پاشا ) بڵاوکراوەتەوە ئەڵێ ، بەڵام بە چ سۆزێکی شیرینو بە چ هەستێکی شەیداو بە چ ڕازو سکاڵایەکەوە :

ئەلا ئەی ڕوهنیا کوردان
خودێ یار بت .. شەریف پاشا

خەلاس کەیت مە ، ژ وان دەردان
خودێ یاربت • • شەریف پاشا

★ ★ ★

رەهاکەت مە ژ سیفیلی
ژ جەورو زیللەتو دیـلی
خودێ ئاهێ مە ، نهێـلی
خودێ یاربت • • شەریف پاشا

★ ★ ★

بەئاهو نالەیان گەشـتی
نما لۆمە ، ژ جان تشـتی
تو بومە ، مەلجەئو پشـتی
خودێ یاربت • • شەریف پاشا

★ ★ ★

پەناهو قەومو قەنجێ مـە
عیلاجی بێ عیلاجێ مـە
ڕەواجو باجو تاجێ مـە
خودێ یاربت • • شەریف پاشا

★ ★ ★

تو میرێ مە ، تو شانێ مـە
تو ڕوحو هەم رەوانێ مـە
تو جانو جاویدانێ مـە
خودێ یاربت • • شەریف پاشا

★ ★ ★

تو هەم ژین‌و حەیاتا مـەی
تو هەم قامو قەناتا مـەی
تو هەم کامو میقاتا مەی
خودێ یاربت • • شەریف پاشا

★ ★ ★

ستوینێ میللەت‌و دیـنی
جیهانێ فیکرو دوربیـنی
جیهانێ مە بجان بینی
خودێ یاربت • • شەریف پاشا

★ ★ ★

بلێ تو جانی جانانـی
مەخاس‌و عام ، دفەرمانـی
مە توی سانی سولەیمانـی
خودێ یاربت • • شەریف پاشا

★ ★ ★

سلەیمان‌و صلاح الدین
کەریم خانی خودان تەمکین
ب عەشقێ خوسرەوو شیرین
خودێ یاربت • • شەریف پاشا

★ ★ ★

دووسەد کەیخوسرەوو پەروێز
هەزاران رۆستەم‌و خونرێز

نەهن وەك تە سیاسەت خێز
خودێ یاربت •• شەریف پاشا

★ ★ ★

وەکی تە ، قەت چ کەس نابن
هەزار تەیمورلەنگ ، ڕابن
تە لوقمانو خدر •• بابن
خودێ یاربت •• شەریف پاشا

★ ★ ★

تو لوقمانو گوزینێ مـە
بکە خەزرا ژ ژینێ مـە
هەتاکەی بیت ، گرینێ مـە
خودێ یاربت •• شەریف پاشا

★ ★ ★

گرینو هێستڕێ خونبـار
دەچاوان تابەکەی بێ خـوار
ژ دەست ( ••••• ) تەزەللوم کار
خودێ یاربت •• شەریف پاشا

★ ★ ★

ژ بەر زولمێ نشین ڕابین
بدائیم دیدە پڕ ئابین
گەلۆ تاکەی وە بێجا بین
خودێ یاربت •• شەریف پاشا

★ ★ ★

ژ بۆچی ( دەرویشی ) دیل بی
ژ دنیادا زەبوون دل بی
ژوان دەردانە ، دل کول بی
خودێ یاربت • • شەریف پاشا

---

بەم نزیکانە :

# کاریتــە
# یا
# ئەودیوی چیـــا

**ڕۆمانی : یەشار کەمال**

**شوکور مستەفا**
کردوویە بە کوردی

---

# لێم زیز مەبن ، ئەگەریەخەتان بگرم !

د. ئیحسان فوئاد

لەم ساڵانەی دواییەدا هەستم بەوە کرد کە بەشێکی دیار لە نووسەرو شاعیرەکانمان ، دەستیان داوەتە چیرۆکنووسین ، لەبەرئەوەی بەلامەوە ئەم هەنگاوە ، گەلێ پێویستو بەجێن ، لە دڵی خۆمدا ووتم : خوا بکات ئەم هەنگاوە سەربکەوێ ئێمەیش لە پلەی هەرزەکاری شیعرەوە هەنگاو بنێین بەرەو پلەی بایەخدان بە چیرۆکو رەخنەوانیو نووسینی شانۆگەری ! ئەم پلەیەش وەکو پلەیەکی کارامەترو پێگەیشتووترو بگرە پیاوانەتریش !

دەڵێم پیاوانەتر چونکە هەرزەکاری ئەگەرچی جۆشێکی گەرمی سەرەتای پیاوەتییە ، بەڵام سەردەمی پێگەیشتنی تەواوی مەردوم نییە ، مەردوم تەنها کاتێك لە پلەی هەرزەکاری دەچێتەدەرێ ، پێیدەڵێن : « بابە ، بووە بە پیاوێکی کامڵ » .

لێرەشدا مەبەستم لە واتا حەرفییە تەنگەبەرەکەی نییە ، بەڵکو مەبەستم لە واتا فراوانەکەی ووشەی : پیاوەتییە . لاشموایە لە دەمێکەوە شارەزایانی ئەدەبیاتو رەخنەوانیو سۆسیولوجی « زانستی کۆمەڵ » یەکدەگرنەوە لەسەرئەوەی کە هۆنراو بەری هەرزەکاریی نەتەوەیە ،

رۆمان‌و چیرۆك‌نووسین‌و شانۆگەری‌و رەخنە بەری سەردەمێکی پێگەیشتووترەو پیاوانەترە ! بڕواش‌ناکەم کەسێك لە شاعیرەکانمان بەم قسەیەی من دڵی بڕەنجێ، چونکە من خۆشم هەر لەو دنیا هەرزەکاری‌یەی شیعردا دەخولێمەوە ، هەرچەند دەکەم ناتوانم هەنگاو بنێم ، بەرەو پلەی چیرۆك‌نووسین ، دیارە ئەمەیش بە دەست خۆم نی‌یە خوا وای‌داناوە هەر هەرزەکار بم خۆ مەسەلەکە کورد ووتەنی « بە ڕیش نی‌یە بە ئیشە » !

بەڵام لەبەرئەوەی چیرۆك بۆ ئێستامان بەرهەمێکی زۆر گرنگ‌و پیرۆزە ، بۆیە زیاتر لایەنگیریی بڵاوبوونەوەو گەشەسەندنی ئەم بەرهەمەم یان بڵێین ئەم جۆرە هونەرەم •

روویەکی تایبەتی دەکەمە چیرۆك‌نووسەکانمان دەڵێم :

ئێمە ئێستا لە ساڵی ١٩٨٢ داین (*)، ئەگەر لەم ساڵەدا هەر منداڵێك لەدایك بێ ، ئەوە بەختیارە چونکە کە تەمەنی گەیشتە هەژدە ساڵ ، سەدە لە بیستەوە دەبێت بە بیست‌ویەك ، واتە تەنیا لە ساڵی دوو هەزاردا ، دەکەوێتە داوی ئەڤین‌و خۆشەویستی‌و دڵداری‌یەوە •

جا بۆئەوەی زۆر شوێن خەیاڵ نەکەوین ، یان لە بابەتەکە دوورنەکەوینەوە ڕوودەکەمەوە چیرۆکنووسەکانمان دەڵێم :

« ساڵی هەزارو نۆسەدو هەشتاو دوو دەزانن چی دەگەیەنێ ؟ ئەوەندەی پەیوەندیی بە ئێوەوە هەیە زۆر شت دەگەیەنێ دەسا بڕێ گوێم بۆ شل‌کەن :

---

(★) ئەم وتارە لە ساڵی ١٩٨٢ دا نووسراوە •

ساڵی ١٩٨٢ : ئەوە دەگەیەنێت کە زیاتر لە سێ چارەکە چەرخ بەسەر کۆچی چیرۆکنووسێکی وەکو ( ئەنتۆن چێخەف ) دا تێپەڕیوە •

ساڵی ١٩٨٢ : ئەوە دەگەیەنێ کە زیاتر لە حەفتا ساڵ بەسەر کۆچی ( لیڤ تۆلستوی )دا تێپەڕیوە ! وە نەوەد ساڵ بەسەر کۆچی دوایی ( مۆپاسان ) دا تێپەڕیوە ! وە نزیکەی سەدوپەنجا ساڵ بەسەر کۆچی دوایی ( گۆگول ) دا تێپەڕیوە ! وە نزیکەی سەدو دە ساڵ بەسەر یەکەم شانۆگەریی لە شاری ئەستەمۆڵدا ( ژنهێنانی شاعیر ) دا تێپەڕیوە !

سەدەیەك یان نیو سەدە لە مێژووی هونەرو ئەدەبی میللەتێکدا ، ماوەیەکی کەم نییە ، خۆ لە مێژووی زانستدا ئەوە هەر مەپرسە ! ؟

بەنموونە لە ساڵی ١٩٠٠ دا بەدەگمەن یەکێك بۆ ئەوە دەچوو کە بە تەقینەوەی بۆمبایەکی چەند کیلو گرامی شارێکی زلو ئاوەدانو جوانی وولاتێك لە چاوتروکاندنێکدا ببێ بە خەڵوزو خۆڵەمێش هەرچی چواردەوریشی هەیە بە سەوزیو ووشکیو بە درێژایی سەدان کیلۆمەتر ببێ بە خەڵووزو زیندەوەری تێدا نەمێنێ • کەچی لە نیوسەدە کەمتری پێنەچوو کە دوو شاری ژاپۆن لە چەند چرکەیەکدا غەوربوونو سووتان ، لە قەومەکەی لووت خراپتریان بەسەرهات ! بۆیە دەتوانین بڵێین کات ئەمڕۆ ئێجگار بەبایەخەو لە هونەرو ئەدەبو زانستدا حوشترمورغی وا دروستدەکات لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نییەو نەبیستراوە !

ناچارم دیسان بکەومە وێزەی چیرۆکنووسەکانمانو بڵێم :

بڕواتان بێت هێشتاوەکو زۆرتان ماوەو زۆرتان لە بەردەمدایەو بارەکەشتان ئەمەندە نالەبارە ، لەوە نییە کەس حەسوودی پێ‌ببات !

شاعیران دەمێکە کۆڕی خۆیان گێڕاوەو ناویان لـە زاری خەڵکیدایـەو هۆنراوەیان بە دەمی ئەمو ئەوەوەیە ، مەجلیسو بەزمی خۆیان گەرم کردو پیرو لاو دەیانناسن :

هەروەکو قەوسوقەزەح با دەس لە گەردن دانیشین

تۆ بە سوخمەی ئاڵو سەوزو من بە رەنگی زەردەوە

کەچی بۆ نەگبەتی ئێوە لەناو زۆربەی خوێندەوارانو رۆشنبیراندا دەنگتان هەیەو رەنگتان نی‌یە ، ئەوەی لێتان تێدەگات ناتان خوێنێتـەوە ، ئەوەی دەتانخوێنێتەوە لێتان تێناگات !

لێرەشدا گوناحەکە لە ئۆبالی بەرەی چیرۆکنووسەکانماندایە بــە هەردوو بەشەکەیانــەوە ، بەشـی راپۆرتچی‌یـە ســاکارەکانو بەشـی ( فەلسوفە ) قالۆنچە پەرستەکان ، واتە ( کامۆ ) هەڵدەرەکانو ( کافکا ) خۆرەکــان •

جا هەروەکو چۆن ڕوودەکەمە راپۆرتچی‌یەکانو پێیان‌دەڵێم :

ئەم ڕووداوە ساکارو بێتامو گەوجو گێلانە چی‌یە کە لە ڕاپۆرتێکی رۆژنامەچی‌یەکی تازە کوورە دەچێ ، ناوبەناو لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا بڵاوی‌دەکەنەوەو ناوتان‌ناوە چیرۆك ؟ ئاخر بەزەییتان بەم خەڵکەدا بێتەوە خۆ زەمان زەمانی « عەلی‌باباو چل دزەکە » نی‌یــە ! قــوربان مەجلیســی رەندانە ئەمە مەیخانە نی‌یە ! !

هەر هەمان رووی گلــەیی دەکەمە بەشـی دووەم لە ( کامــۆ ) ـ هەڵدەرەکانو ( کافکا ) خۆرەکانو پێیان‌دەڵێم :

بڕواتان بێت ئەم جەلجەلووتی‌یە گرێکوێرانە ، مەتەڵێکە بە کەس

هەڵناهێنرێت ، دەسا تۆزێك بیر لە نەتەوەو شەقامو خانوو عەبابەسەرەكان بكەنەوە ! كە ئێمە ( چیخەف ) و ( موپاسان ) و ( تۆلستۆمان ) نەبێ لەكوێ ئەم هەمو ( كامۆ ) و ( كافكایە ) لەدایك بوون ؟ راستە چەرخ چەرخی خێراییە بەڵام خێراییەكە لە دروست كردنی هەموو پلەكان دروست دەبێت ، چونكە پێپلكە لە ئاسماندا ناوەستێو پێویستی بە بناغەو بناوانە ، پیاو « بە هەلهەلە ناتوانێ لە بەحری ووشكی هەوادا پێ مەلە بكات » !

خۆ ئەوەشم لەبیرناچێ رووی میهرەبانی وەربگێڕم بۆ خوێندەوارانی ئازیزو بەرێزو تینووی رۆشنبیری ، بەتایبەتی لە لاوانو قوتابیانو خوێندكارە خوێن گەرمەكانمانو بەتكاوە بڵێم :

ئاوڕێكی دڵسۆزانە لە بەرهەمی چیرۆكنووسەكانمان بدەنەوە ، وا لە داخی بێبازاڕی خەریكن دەبن بە باڵۆنو دەچن بەو ئاسمانە پانو بەرینەدا ، بێ ئەوەی ئەوە لێك بدەنەوە كە ئەمڕۆ سەدەی مانگی دەستكردو فرۆكەی لە دەنگ خێراترو رۆكێتی دەریابڕە !

روویەكیان تێ بكەنو تۆزێ بایەخ بە بەرهەمەكانیان بدەن ، چونكە هەریەكەیان دەستەیەك لاوی بەسەزمانو ( گوناح ) یان لەدەوری خۆیان كۆكردۆتەوە « دەچیرۆكێنن » بەسەریاندا !

دەسا لاوو كیژە خوێن گەرمە رۆشنبیرەكان ! ئەمە بكەنو سێو دووی لێ مەكەن چونكە گەلێ دوواكەوتووینو پیاویش هەتا گەنجە گەنجە ، كە پیر بوو ناتوانێ لافی هەرزەكاری لێ بدات ، چونكە ئەگەر بە رۆژیش ئەمەی جاروبار بۆ بچێتە سەر ، شەوی بەسەردا هات وەكو ( حەمەندی ) دەڵێ مەگەر شمشاڵی بۆ لێ بدات دەنا لە جێی خۆی ناجمێ ! •

# بگرمێنن •• بگرمێنن •• دەهۆڵەکان !

شیعری : واڵت ویتمەن
عەبدوڵلا پەشێو
لە ئینگلیزی‌یەوە وەرگێڕاوە

بگرمێنن ! بگرمێنن ! دەهۆڵەکان !
بهاڕێنن ! کەڕەناکان ! بهاڕێنن !
وەك لەشکرێکی بێبەزەیی ،
لە پەنجەرەکانەوە ،
لە دەرگاکانەوە وەژوورکەون •
خۆتان بکەن بە کلێسەی بەسامداو
کۆڕی نوێژکەران تێك‌و پێك‌دەن •
خۆتان بکەن بە قوتابخانەدا ، کە تێیدا قوتابی دەخوێنن •
مەهێڵن زاوا ئاسوودە بێ ،
وەختی ئەوە نی‌یە بە دەسگیرانەکەی خۆی شاد بێ
مەهێڵن وەرزێر بە دڵنیایی زەوی بکێڵێ ،
یا دەغڵ‌و دانەکەی خۆی بدروێتەوە •
تا دەنگتان تیایە بهاڕێنن ، کەڕەناکان !

★ ★ ★

بگرمێنن ! بگرمێنن ! دەهۆڵەکان !
بهاڕێنن ! کەڕەناکان ! بهاڕێنن !
ژاوەژاوی هاتوچـۆی شاران کپ کـەن
گڕو هۆڕی پیچکە گالیسکەکان سەرشەقامەکان بخنکێنن •

★ ★ ★

جێیە ؟ بۆچی لە ماڵاندا ، پێخەف بۆ خەواڵووان ڕاخراون ؟
نەء ، ئەمشەو نابێ خەوالووەکان
لەناو نوێنـا بنوون !
ئەمڕۆ ، با ئەهلی بازار
سەوداو مامرەتی (١) خۆیان راگرن !
چی‌یە ؟ دەلال‌و چەرچی‌یەکان سوورن لەسەر ئەوەی
لەسەر ئیش‌و کاری خۆیان بەردەوام بن ؟
چی‌یە لە ڕۆژێکی وادا
چەنەبازەکان سوورن لەسەر ئەوەی
خەریکی قەوچەقەوچی خۆیان بن ؟
دەنگبێژەکان دەیانەوێ گۆرانی بڵێن ؟
دادیار لە دادگا راست‌بێتەوەو لە بەردەمی داوەردا
لەسەر کەسێك بکاتەوە ؟
دەسا ، بەلەزتر(٢) ، توندتر ، بگرمێنن ، دەهۆڵەکان :

---

(١) مامرەت : سەودا ، مامەڵە •

(٢) بەلەز : خێرا •

بلندتر بهاڕێنن کەڕەناکان !
بگرمێنن ! بگرمێنن ! دەهۆڵەکان !
بهاڕێنن ! کەڕەناکان ! بهاڕێنن !

★ ★ ★

دان نەنێن بە وتووێژدا !
ئامۆژگاری کەس لەگوێ نەگرن !
بەزەییتان بە ترسنۆکاندا نەیێتەوە ،
با هەر بۆ خۆیان بگریێن‌و بیاڕێنەوە ،
گوی‌مەدەنە ئەو پیرەی داوێنتان دەگرێ ،
گوێ‌مەدەنە زیڕەی منداڵ‌و کرووزانەوەی دایك ،
تەنانەت ئەگەر دارەبازەتان بە مەیتەوە دیت
ئەوساش ، تا هێزو گوڕتان تێدایە
بگرمێنن ئەی دەهۆڵە سامناکەکان .
تا دەنگتان تێدایە بهاڕێنن ، ئەی کەڕەناکان !

# پردی وەنەوشـــە

**مســـتەفا سالح کەریم**

« هیچ چارێکم بۆ نەماوەتەوە ، ئەبی بڕۆمو بیبینم »

پاش نیوەڕوانێکی درەنـــگ بوو ، هێشـــتا لـــە تاوتووکردنی ئـــەو مەسەلەیە نەبووبووەوە کە گینگڵی پێوەئەدا • چەند جارێك ئەم ڕستەیـــە لە دەروونیا دەنگی دایەوەو لەبەرخۆیەوە دەیوتەوە :

« ئەبێ بچم بۆلای • چار چی‌یە ! ڕێگای تر نی‌یە لەبەری‌بگرم • ئەبێ ڕاستەوخۆ هەموو شتێکی بۆ ڕوون‌بکەمەوە » •

لەدوای نان‌خواردنی نیوەڕۆوە چووبوە نهۆمی سەرەوەو دەرگای ژوورەکەی لەسەر خۆی پێوەدابوو• کەسی نەئەدواند• لەسەر جێگاکەی ڕاکشابوو ، بەڵام خەوی لێ نەئەکەوت • تەنانەت ئەو کتێبەشی کـــە لەگەڵ خـــۆی بردبوویـــە ســـەرەوەو ڕۆژان زۆر بەتاســـەوە خۆی بـــە خوێندنەوەیەوە خەریك‌کردبوو ، ئەمڕۆ تا ئەوساتە هێشتا بێ‌نـــاز بـــوو دەستی بۆ نەبردبوو •

ڕۆژێ بوو لەو ڕۆژانەی « کـــەمال »ی هێنابـــووە جۆلانـــە • ئـــەو ڕووداوە تەواو هێنابوویە ژارو ژەنگ • مێشکی ئاڵۆزو جەنجاڵ بوو •

بە پەنجەکانی ناوچەوانی ئەگوشی‌و وای هەست‌ئەکرد خەریکە کاسەی سەری لە لەشی جیائەبێتەوە •

« ئەبێ ڕادەیەك بۆ ئەم پشێوی‌یە دابنێم • ئەبێ بۆ یەکەم جـار داخی بەرودوای بێ بڕێژم » • جگەرەیەکی داگیرساندو چەند مژێـکی لێ‌دا • دوکەڵەکەی لە سەرو سنگیەوە بەرەوژوور شێوەیەکی بازنەیـی پێچاوپێچی دروست‌ئەکردو هەوای پانکەی ژوورەکە ئەیڕەوانەوەو بەناو پەنجەرە کراوەکەدا ڕاوی‌ئەنا « پەنجەرەی ژوورەکەی ئەوسام بەسـەر ڕووبارە گەورەکەی شارەکەدا ئەیڕوانی • هەموو ئێوارانێك کردبووم بە خوو لەوێوە سەیری ماسی‌گرو ماسی‌فرۆش‌و جووت جووت عاشقانی ژێر درەختەکان‌و شێوەی ئەستێرە گەشەکانی ناو ڕووبارەکەم دەکرد »•

گوێی لێ‌بوو لە باخچەی ماڵە دراوسێکەیانا کە ژوورەکەی بەسەریدا ئەیڕوانی کچە گەورەکەیان باسـی دامەزراندنـی خـۆیی بـۆ براکانی ئەگێڕایەوە • دیاربوو زۆر دڵی بە شوێنی ئیشەکەی خۆش بوو « منیش ڕۆژێکی‌وام بەخۆمەوە بینی بەڵام تا سەر نا ••• کە خوێندنم تەواوکرد زۆر بەختیاربووم، بەڵام هەموو دەرگاکانم لەڕووا داخرا• بە واتەی ئەوان « ڕەوشت‌باش » نەبووم • چەندەها لاوی وەك من کە لەتوانایانا بـوو تەنانەت بەردیش بهاڕن ، بەتاڵی‌و بێ‌ئیشی ژیانیانی ئەهاڕی • لەئەنجاما بەهۆی ناسیاوێکەوە لە ڕۆژنامەیەکدا دامەزرام •

لە شەقام‌پێوان ڕزگارم‌بوو • مەمرەو مەژی لە زوورێکی خنجیلانەدا گوزەرانم ئەکرد » •

جارێکی‌کەش دیسان دەنگی کچە دراوسێ بەئاگای هێنایەوە کـە بە برا گەورەکەی ئەووت : کاکە چیمەنی حەوشەکەمان زۆرە ، لایەکمان بۆ بکە بە شتایگەر بۆ دانیشتـن « حەوشـەی خانوەکەی ئـەوسام زۆر

بچووك بوو • چلێ سەوزایی تیا نەبوو، خاوەن ماڵ پیرەمێردو پیرەژنێك لە دەستەیەکیاو ژوورێکیشیان دابووە زاواکەیان • ژووری سەرەوەشیان منی تیا بووم • تەنها هۆدەو هەیوانێك بوو • شتومەکی چاو چێشتلێنانو جلشتنم خستبووە هەیوانەکە • قەرەوێڵەو نوێنو جلوبەرگو پێویستیی خۆمو دوو کورسیو مێزێـكو کتێبەکانـمو پارچەیـەك ڕایەخیش لـە ژوورەکەدا بوو • لە سەرەتادا پشـێوی بـە هەمووشتێـکی ژورەکەمەوە دیاربوو ••• »

ئەمجارەیان دەنگە دەنگی کرێکارانی ئاگرکوژینەوەکە ، کە لەوبەر ماڵەکەیانەوە لە چاخانە بچکۆلەکەدا دامەیان ئەکرد هێنایەوە هۆش خۆی، بەڵام ئەوەندە یادگارەکانی لا مەبەست بوون بەدەست خۆی نەبوو کـە بەئاسانی بچێتـەوە باوەشیانو یـادی ڕۆژانـی ئـەو سەردەمـەی بێتـە گیانلەبەرێکی ئێسكسووكو لە بەردەمیا قوتبێتەوە « ئـەوکاتەی ئـەم ئافرەتەم تیا ناسی هەڕەتی لاویمان بوو ، خوێنگەرمو چاونەترس ، دڵ پڕ لە هیواو ئاوات • ئەودەمە ساڵی دوەمـی بـوو لە کۆلێژی شاژنـە عالیە ، ٢٦ ساڵ لەمەوبەر بەخوا زۆرە ! تەمەنێکە ! هەیهوو !! »

دەستی بۆ پاکەتەکەی برد ، جگەرەیەکیتری داگیرساند • لەگەڵ پژیسکی چەخماخەکەیا دەمارەکانی مێشکی هەڵایسانو بەرودوا شریتی بیرەوەرییەکانی ئەو ساڵانەی ڕوونتر هاتنەوە بەرچاوی « خۆیشم نازانم چۆن چۆنی هاتە دڵمەوە ؟ چۆن ئەو سەرەتا هێمنە وا کڵپـەی سەندو بووە خولیای شەوو ڕۆژم • هەرچەند قۆڵم بەقۆڵیا ئەکردو بەجووت بە گوێ ڕووبارە پڕ لە نهێنییەکەدا پیاسەمان ئەکرد ، ئامادەبووم خۆمـی بۆ بکەم بە قاڵی بۆ ئەوەی بەسەرما بڕوات • ئا ••• وەك بێتەوە یـادم سەرەتامان بەهۆی نووسینـەوە ڕێچـکەی بەسـت • لـەوکاتەدا ئەویش

شەیدای وشە بوو • منیش بە ماوەیەکی کەم شەیدای بەژن‌و باڵاو گەردن‌و چاوو برۆی ئەو بووم ، چاوەکانی زیاتر هانی یاخی‌بوون‌و بڕوای بەتینیان ئەدام • کە پەنجەکانی لەتەك پەنجەما دەست‌لەملانێ‌یان ئەکرد وام‌ئەزانی دەستم لەناو ئاوریشما سەرخەو دەشکێنێ • شەوانیش کەوتبوومە ئەستێرە چنی • ئێواران تێر دەمڕوانی‌یە کۆترەکانی ماڵە دراوسێکان کە بەجووت ئەچوونەهێلانەکانیانەوە• پڕبەدڵ خۆشم‌ئەویستن چونکە وێنەی خۆمانم تیایانا بەدی‌ئەکرد • هەموو بڕوایەکی خۆمم دایە • زۆرم متمانە پێ‌ئەکرد • لەوە دڵنیا بووم کە ئەو دڵە ناسکەی لە من زیاتر جێی هیچ کەسێکی‌تری تیا نابێتەوە » •

زرەی تەلەفۆنەکە یادگارەکانی لێ ئاڵۆزاند : « ئەم منالانە سەیرن چ‌پێویست ئەکات تەلەفۆن بۆ ئەم ژوورە ڕابکێشن» دەستی دایە تەلەفۆنەکە گوێی‌لێ‌بو کوڕە بچکۆلەکەی بەچرپە قسەی تیا ئەکرد ، بەخێرایی ئەوەی لای خۆی داخستەوە ، زانی بەری ئەولا کچێکی هاوڕێی کوڕەکەیەتی « ئەوسا منیش هەرچەند زرەی تەلەفۆن بهاتایە دڵم ئەکەوتە پەلەکردن ، بەلایەنی کەمەوە ڕۆژی دوو جار داوای ئەکردم • بەیانیان لە یانەی کۆلێژەکەیانەوە • پاش نیوەڕوانیش لە بەشی ناوخۆوە • زۆرجار ڕۆژنامەنوسەکانی هاوڕێم کە لە ژوورێکی ڕۆژنامەکەدا پێکەوە کارمان‌ئەکرد لەگەڵ دەنگی تەلەفۆنەکەدا سەیری منیان دەکرد وەك بڵێن فەرموو تۆیان ئەوێ‌و لە بەختی خۆشتان هەرچی‌یە ئەڵێن ئێمە تێی‌ناگەین • منیش کە گوێم لە دەنگی ئەبوو هەر ئەوەندە بوو نەئەتوامەوە ، چرپەکانی خۆشترین ئاوازم بوون ، بۆ من نەرمە پێکەنینەکەی کردنەوەی دەروازەی بەهەشت بوو » •

چاوێکی بەژوورەکەیدا گێڕا • هەوایەکی فێنك گەرمایی‌یەکەی

لەشی کەمێك ڕەواندەوە • هەستایە سەر پێ ، زەردەخەنەیەك کەوتە سەر لێوی • کە لەبەردەم باڵا ئاوێنەکەدا ئاڵۆزکاویی خۆی بینی ژوورەکەی ڕێك‌وپێك‌و خۆی ژاکاو « ئەوسا خۆم ڕێك‌وپێك بوومو ژوورەکەم شێواو ، هەموو ڕۆژێکی هەینی « دڵخواز » ئەهات بۆلام دەستێکی بە ژوورەکەما ئەهێناو پاکی ئەکردەوە ، کتێبە پەرش‌و بڵاوەکانی بۆ کۆئەکردمەوەو ڕیکی‌ئەخستن ، کراسەکانمی لەئوتوئەدا، ئەمجا بەرکۆشەی پیرەژنەکەی خاوەن‌ماڵی ئەخواست‌و چێشتێکی بەلەزەتی لای خۆمانی لێ‌ئەنا • لەدواییدا پێکەوە نانەکەمان ئەخواردو ئەمجا قاپەکانمان ئەشت‌و وشکمان‌ئەکردنەوە • چالێ‌نانیش بەشی من بوو • دوای تاوێ خوێندنەوە ئەچووین بۆ پیاسە • کە ڕۆژ ماڵ‌ئاوایی لە دەم کەل ئەکردو تا چاوبڕکا بەو ڕەنگە سوورەیەوە لێمان ئاوا ئەبوو ، دڵخوازم بەرەو بەشی ناوخۆکەیان ئەبردەوە •••• »

دەنگێك ــ مەچۆ ! دان‌بەخۆتا بگرە ، چ‌پێویست ئەکات کای کۆن بە با بکەی •

دەنگێکی‌تر ــ بچۆ ، پێ بە جەرگی خۆتا بنێ ••• مەسەلەکە لەوە گرنگترە پشت گوێی بخەی •

بۆ یەکەمجار لەدوای نیوەڕۆوە دەرگای ژوورەکەی کردەوە بە پلیکانەکانا هاتەخوارێ سەرێکی هۆڵەکەی دا • چاوێکی بە کوڕەکانیا گێڕا • بچکۆلەکەیان ڕاکشابوو ، بەڵام نەنوستبوو • ناوەنجی‌یەکەیان خەریکی نەخشەی تابلۆیەك بوو • گەورەکەشیان کتێبێکی ئەخوێندەوە • پەرداخێ ئاوی ساردی خواردەوە گەرووی تەزاند • گەڕایەوە ژوورەکەی سەرەوەو لەسەر جێگاکەی پاڵ‌کەوتەوە • دەستێکی خستە سەر سەری‌و

ئەوەکەی تریشیانی نایە سەر دڵی « ئای لە دڵ لە سەرەتادا وەك کاغەزێکی تەنکی سپیی پاك وایە ، هەر ئەوەندە تاری خۆشەویستی ئاوازێکی بۆ لێدا ئەو کاغەزە سپی یە وەك دە قەڵەم درابنە دەست منداڵان و بکەونە ڕەش کردنەوەی و هێنان و بردنی ، ئاوا دڵەش ئەکەوێتە ماخۆلان • دڵی ئەوسای منیش بەڕادەیەك گیرۆدەی دڵخواز بوو جڵەوی لێ سەندبووم • درەختێکی سەوز بووم و هەناسەم لە سی یەکانی ئەوەوە وەردەگرت • گوڵی ئاواتم لە لێوەکانیا ئەگەشایەوە • چاوە بریقەدارەکانی ئاوێنەیەك بوون دوارۆژی خۆمم بەڕوونی تیایانا ئەبینی ، زۆر جار داپیرەی خاوەن ماڵ کە ئافرەتێکی دیانی سەرسپی خاوێن و ڕووخۆش بوو لە بەڕێ کردنمانا ئەیوت : خوا لێکتان نەکات ، مریەم مرادم بدات لێرە زەماوەندتان بۆ بگێڕم » •

بۆ جاری دووەم هاتەوە خوارێ ، نیگایەکی پڕ لە خۆشەویستی بڕی یە کوڕەکانی • ئەو هەڵبزرکاوی یەی لە چاوەکانی کوڕە گەورەکەیا بەدیی کرد ئەوەندەی تر هەژاندی • دڵی وەك چۆلەکەی ملهەڵکێشراو کەوتە هەڵبەزو دابەز • بەپەلە سەرکەوتەوە « ئیتر هیچ چارم نی یە ئەبێ بچم • چۆن ئاوا جگەرگۆشەکەم بە بەرچاومەوە بتوێتەوەو نەجووڵێم • ئەبێ شتێکی بۆ بکەم ، نابێ بهێڵم خونچەی هیوای هەڵوەرێ » •

کوڕە ناونجی یەکەی بیرەوەری یەکانی لێ پساند • بەهێواشی هاتە ژوورەوە :

— بابە پێت نەوتین دەنگ وباسی ڕۆیشتنمان گەیشتە کوێ ؟

— هیچی تازە نی یە • هەرئەوەیە کە خەڵك ئەیڵێ •

— ئەگەر وابێ ئەم ساڵ هەریەکەمان بەلایەکا پەرەوازە ئەبین •

ـــ چار چی‌یە ؟ هەرچۆنی بێ تا پشــووی هاوینە تەواو ئەبێ ، ئــەو مەسەلەیەش بەلایەکا دەکەوێ •

کوڕەکەی چووە دەرەوە • وشەی پشــووی هاوینــە لەگوێیــا ئەزرنگایەوە • « پشــووی هاوینەی ئەوساڵەیش تەواوبــوو • دڵخــواز گەڕایەوە • چووە پۆلی سێیەم • ڕۆژبەڕۆژ خۆشــەویســتی‌یەکــەمان کڵپەی ئەسەند وەك کڵپەی شەقامەکانی شار کــە گیانی جــەماوەری بــۆ پاڵپشتیی گەلی میسرو بۆ بێزاری بەرامبەر بەو هێرشە سێقۆڵی‌یەی کرابوە سەری خرۆشاندبوو » •

دەستی بۆ کتێبە بێ‌تازەکەی تەنیشتی برد • لەوشوێنــەدا کە تیــا وەستابوو دەستی بە خوێندەنەوەی کردەوە ••• بەرەبەرە تا گەیشتە ئەو دێڕانەی کە پاڵەوانەکەی لەناو زیندانێکی تاریکا جێگیر بوو ••

« پایز بوو شەوێ لەناکاو بەسەر ژوورەکەما داباریــن ، پێش خۆیان دام • کە خرامە ناو ئۆتۆمۆبیلە ڕەشەکەوە ئەوەم بەبیرا هات کێ بێ ئەم هەواڵە بە دڵخواز بگەیەنێ • هەمووی چەند سەعاتێ لەمەوبەر بەتەلەفۆن بەڵێنم‌دایە کە ڕۆژی هــەیلی بیبــەم بۆســەلمانی پاك • خرامە ژوورێکی تەنگەبەری تاریکــەوە • بۆنێــکی یەکجــار پیســی لێ ئــەهات • دەرگا ئاسنەکەیان بەدووی خۆیانا داخست • ئیتر هەر ئەو داخستنە بوو مەگەر بۆ شۆرباو سەموونەکە بکرایەتەوە ••• مەسەلە درێژەی کێشا • گــەلێ شەو لە خەو ڕائەپەڕیم ، تاریکایی ژوورەکە ئەیهێنامەوە ئــەو جیهانــەی تیایا ئەژیام • هەرچی خەونێکیشم ئەبینی هــەر بە دڵخــوازەوە بــوو • هەمیشە شێوەیم لە بەرچاو بوو • جارێــکیان زۆرم بــۆ هات کەوتمــە لێدانی دەرگا ئاسنەکە • پڕ بە ژوورەکەم قیژاندم : چیتان لێم‌ئەوێ ؟ تــا

کەی لێرەدا بم ؟ بۆ لێم‌ناپرسنەوە ؟ بەڵام لە هەڕەشەی پاسەوانەکان
بەولاوە هیچی‌ترم نەبیست » •

جارێکی‌تریش گەڕایەوە سەر کتێبەکە • پاڵەوانی سەرەکی ڕۆمانەکە لاوێك بوو کاتێ دایکی بۆ سەردانی ئەچوو بۆ بەندیخانە ، پێش هەمووشتێ هەواڵی دڵدارەکەیی لێ ئەپرسی : بۆ نایەت بۆلای ؟ ئاخۆ کەس‌وکاری ماوەی نادەن ؟ دایکە دڵسۆزەکەشی هەر جارەی بیانوویەکی بۆ ئەهێنایەوە •

« کاتێك فەرمانی ٣ ساڵ بەندکردن بەسەرما درا ، هیچ پێی تێك‌نەچووم • خەمم بۆ نەخوارد • بەپێچەوانەوە بەخۆم ئەوت : بەس‌نی‌یە ئیتر هیچ نەبێ مانگی جارێك دڵخواز ئەبینم • دیارە لە یەکەم سەردانمانا یەکەم میوانی من ئەو ئەبێ• پەنجەکانی ئەخەمە ناودەستمەوە• دڵخۆشیی ئەدەمەوە • ناهێڵم خەفەت بخوات • ورەی ئەخەمەبەر • سێ ساڵ چی‌یە ؟ وەك لای خۆمان ئەڵێن پێچی مێزەرێکە ••• بەرەو بەندیخانەی مەرکەزی براین • لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەو هاوڕێیانەی ماوەیەك بوو یەکتریمان نەدیبوو پێك گەیشتین • جێگاو ڕێگای خۆمان ڕێك‌خست • بەرنامەی ژیانی ڕۆژانەمان بەباشی بەجێ‌ئەهێنا ••• ئەمجا ئیتر خوومدایە ڕۆژ ژماردن بۆ سەری مانگ •• بۆ بینینی دڵخواز » •

کتێبەکەی هەر بەدەستەوە بوو ، چاوی بڕیبوە تابلۆیەکی بەرامبەری کە کۆمەڵێ ئەسپی ڕەسەنی تیا جێگیر بووبوون ، بەڵام هونەرمەندەکە بەشێوەیەك نەخشەی کێشابوون هەریەکەیان بە سمکۆڵەکەیا دیاربوو ئەیەویست قەڵەمباز بدات‌و بەرەو ئەم جیهانە بەرینە بە سەربەستی تەکان‌بدات « ئێمەش ، هەموو بەندیەکانی ئەو بەندیخانەیە وەنەبێ بەو چارەنووسە قایل‌بووبین • زۆربەی هەرەزۆرمان هەر لەسەر ئەو

بیروباوەڕەی دەرەوەی ئەو چوار دیوارە بووین ••• چاوەڕوانی قەڵەمبازێکی مەردانە بووین، سەیرە ، من لەپاڵ ئەو چاوەڕوانی‌یەشما زۆر بەتاسەوە بووم بۆ سەری مانگ کە رۆژی سەردانە ، ئەو بەیانی‌یە خۆم بۆ پێشوازیی میوانەکانم ئامادەکرد ، لەپێش هەموانا باوکمم دی چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك• گەلێ دڵخۆشیم دایەوە، پێم‌وت نەئەبوو ئەرکی هاتن بکێشێ‌و خۆی تووشی ئەم ماندووبوونە بکات • نەم‌ئەزانی کە لەم‌ماوەیەی پێشوودا چوار جاری‌تر هاتوەو کون‌و قوژبنی ئەم شارە جەیحوونەم بەدوادا گەڕاوە ، بێ‌ئەوەی وەڵامێکی ڕاستی بدەنەوە • پاش ماوەیەکی کورت دوان لە هاوڕێ ڕۆژنامەنووسەکانیشم هاتن ، بەڵام من چاوێکم کردبوو بە دوان وێڵم‌کردبوون، بەدوای لەیلەکەما ئەگەڕان• لە کۆتایی ئەو سەردانەدا ناوونیشانی دڵخوازم بە یەکێ لە هاوڕێکانم داو پێم‌وت : ئەم‌جارە بە بێ‌ئەوە مەیەن بۆ لام » •

ئەمەندە دڵی پڕبوو • هەستی‌کرد خەم‌و پەژارەی جارەکە سەدەیەك لەمەوبەر وەك ئەم بەری چاوەکانی گرتووە • بە دەسەسرێکی تەنك چاوەکانی سڕی‌و کەوتەوە خوێندنەوەی ڕۆمانەکە • خۆشی ئەیئەزانی بۆچی بۆ جاری دووەم ئەم ڕۆمانە دەخوێنێتەوە ؟ ئاخۆ بۆئەوە بێ یادگارەکانی خۆی بێنەوە پێش چاو یان بۆئەوەی لەم جیهانە جەنجاڵەی ئێستای دووربکەوێتەوە • پاڵەوانی ڕۆمانەکە لەپاڵ ئازاری خۆیاو لەگەڵ ئەو نەخۆشی‌یەشدا کە تووشی بووبوو دڵی هەر لای خۆشەویستەکەی بوو • هەمیشە بیری‌ئەکردەوە • بێ‌ئارامی بووبوە هاوڕێی شەوو ڕۆژی « ناحەقی نەبوو • منیش شەوەها پێش نووستن بە سەعات زیاتر گفتوگۆم لەگەڵ تارمایی‌یەکەیا ئەکرد • هەندێ‌جار وام‌ئەزانی بەڕاستی لەگەڵیا ئەدوێم• کە لەبەرخۆمەوە دەموت: دڵخواز گیان لەوەوبەر زۆر لە مردنم

ئەترسای • هەرچەند وشەی مەرگ بە زمانما بهاتایە هەڵئەبزرکای و ئەتوت : نامەوێ گوێم لەم وشانە بێ • خوا هەرگیز ئەوەم پیشان نەدات • کەچی وا ئێستا وەك گوڵی بەهارەی سیس بوو لە هەڵوەریندام • زەردەخەنەکەی جارانم کوژاوەتەوە • چاوەکانم بریقەی ئەوسایان نەماوە • بەرەبەرە خەریکم ئەبم بە خۆڵەمێش • وا تێنەگەی لەبەرئەوەیە من بەندم و لە زیندانی دوشمنا دەستبەسەرم • نە •• نە ، ئازیزەکەم لەتاو دووریی تۆیە » •

برژانگەکانی کەوتنەوە ڕاماڵینی دێرەکان، دایکە هەناسە ساردەکەی پاڵەوانی ڕۆمانەکە بەدڵیا نەهات کسپە لە دڵی کوڕەکەی هەڵسێنێ • هەرجارەی بیانوویەکی بۆ ئەهێنایەوە تا ئەو نهێنی یەی لەگەڵ خۆیدا بردەگۆڕەوە ، بەڵام خوشکەکەی پێی بەجەرگی خۆیا ناو دوانامەی خۆشەویستەکەی پێگەیاند کە تیایا نووسیبووی : « بەدەست خۆم نی یە ئەبێ بە قسەی کەس و کارم بکەم ••• ئەبێ بۆ یەکێکی تر بم • بەڵام دڵنیا بە هەتا هەتایە یادگارە شیرینەکانی تۆم لەبیر ناچێتەوە » • لەگەڵ دواوشەی نامەکەدا خوشکەکەی پێی وت : بەتەمای چی بوویت ؟ بەتەما بوویت پرچی سپیت بۆ بهۆنێتەوە ! لەتوانایا نەبوو چاوەڕوانت بکات •

« بەڵام من هەر چاوەڕوانی هاتنی دڵخواز بووم ••• کە سەری مانگی دووەم هات وامئەزانی پەیامێکی ئاسمانیم بۆ هاتووە ، کە چاوم پێی کەوت کەسی ترم بیرنەما ، بەپیریەوە چووم و لەسەر ئەو بەتانی یەی ڕامخستبوو پێکەوە دانیشتین • بەدەم هەنسکەوە پێی وتم :

— ئەمە دواجارە بۆ ئەم شوێنە دێم •

— بۆ ؟

— نامەوێ ئیتر لێرەدا بمێنیتەوە •

ـــ بۆچی بەدەست خۆمە ؟

ـــ بەڵێ ، بەدەست خۆتە

ـــ تێناگەم

بەدەم هەنسکەوە ئەمجارەیان وتی :

ـــ لەپشووی نیوەی ساڵا خوازبێنی کرام ، بەڵام من خۆم بەدەستەوە نەداو سوور بووم لەسەرئەوەی شوونەکەم • لەپاشا زۆریان بۆ هێنام • منیش پێوەندی نێوان خۆمانم لای دایکم درکاند • دیارە ئەویش بە باوکمی وتبوو •

ـــ باوکم هاتەسەر ئەو ڕایەی ئەگەر تۆ منت بوێ ئەتوانی ئازادبی‌و لە بەندیخانە دەربچی •

ـــ چـۆن ؟

ـــ باوکم لە خۆیەوە ئەم ڕایەی دەرنەبڕی • دوای ئەوەی کاربەدەستە گەورەکانی بینی پێیان وتبوو مەسەلەکە ئاسانە • با دەست لـەو بیروبـاوەڕە هەڵبـگرێ‌و پەیمانبـدات کـە لـەو مەسەلانـە دووردەکەوێتەوە ، ڕاستەوخـۆ بەریدەدەین‌و بـە دڵـی خـۆشی دای‌دەمەزرێنین •

ـــ ئاخر ، ئەمە لەتواناما نی‌یە •

ـــ کەوابێ منیش لەتواناما نی‌یە بەرهەڵستی‌یان بکەم • ئەبێ بەوکەسە قاییل بم کە داوای کردووم •

ـــ ئەی ئەو هەمو خۆشەویستی‌یەمان واتلێ‌ناکات دوو ساڵ‌و چەنـد مانگێ چاوەڕوانم بکەی ؟ •

ـــ مەسەلەکە لای من هەر ئەو ماوەیە نی‌یە ، بەڵکو هەموو درێژایی ژیانمە ، چونکە تۆ لەسەر ئەم بیروباوەڕە بی ئەبێ منیش هەر بـە

ڕێگای بەندیخانەکانەوە بم • ئەبێ ئەوەش بزانی کە ئامادە نیم بێوەژن کۆشی بکەم •

— ئەمە دوابڕیارتە ؟

— بەڵێ •

ئەمەی وت‌و دەستی بۆ دەستم درێژکرد • دواوشەی ئەوەبوو :

— با وەك هاوڕێ لێك جیابینەوە •

تا لە چاوم ون‌بوو هەر سەیری هەنگاوەکانیم ئەکرد ، لەگەڵ دوا هەنگاویا تەزوویەکی سارد بەدڵما هات، بێ‌دەنگ لە جێگاکەی خۆما دانیشتمەوە • دوای تەواوبوونی سەردانەکە بەرەو ژوورەکەمان خۆم کێش‌کرد • هەستم کرد بنمیچەکە ئەسووڕێتەوە » •

کە لەگەڵ شریتی بیرەوەری‌یەکانیا گەیشتە ئەم هەڵویستە سەختە، هەستی بە پەستی‌و دڵگوشراوی کرد • بۆیە وەك دەست بۆ حەبێکی ئەسپرین بەرێ دەستی دایەوە رۆمانەکە • پاڵەوانەکەی لە گێژاوێکی سەیرا دەژیا ، هاوڕێکانی ژوورە تەسکە پیسەکەی هەستیان بەوە کرد کە لەوەئەچێ ئەو پردەی بە جیهانی دەرەوەی دەگەیاند پسابێ • شەوان هەر ئەم‌دیوەودیوی ئەکرد • خەو نەئەچوە چاوی •

« چاوەکانی منیش لە خەو تۆران ، دواوشەی دڵخواز وەك خەنجەر چەقیبوە سەر پەڕەی دڵم • خۆم لەناخەوە بە خۆمم ئەوت : کوا زەنگی کڵێسەکانی گەرەکەکەی جارانم بۆ دەنگیان نایەت ؟ ئەی داپیرەی خاوەن‌ماڵ بۆ نایەت لەباتیی ئەو زەماوەندەی بەتەمابوو بۆمان بگێڕێ ، بۆ نایە تەرمی خۆشەویستی‌یەکەم لەگەڵا بەڕێ‌بکات ؟ ساڵێکی تەواوو چەند مانگێك خۆشەویستی ، هەموو رۆژێ پێکەوە ، نووسینگەی رۆژنامەکە ، ژوورە خنجیلانەکەم ، شەقامەکانی لای کۆلێژو بەشی

ناوخۆکەی ، گوێ رووبارەکە ، تەنانەت شتە وردیلەکانی ژوورەکەم کە پێکەوە کڕیبوومان • سەیرە ! چۆن ئەمانە هەمووی بە چاونووقاندنێ لەبیر خۆمیان بەرمەوە ••• تا چەند رۆژێ هەر وڕ بووم ، لەدواییدا کەوتم • ماوەی حەوت رۆژ لەسەریەك تاملێئەهات ، وڕینەم ئەکرد ، لە جێگاکەما جووڵەم بۆ نەئەکرا • لەوە ناخۆشتر نی‌یە لە بەندیخانەدا نەخۆش بکەوی • ئەبی بە ئەرك و بارێکی گران بەسەر هاوڕێکانتەوە • لە گەرمەی تینی ئەو تا قورسەما ، لەگەڵ نوقم‌بوونی سەرتاپای لەشما لە ئارەقەو جواناوڕشتنا ، وێنەکەی دڵخواز لە بەرچاوم ون‌نەدەبوو ••• دەڵێن : لە کاتی تەنگانەدا مردن سامی نامێنێ • هەرچەندە لەڕاستیدا من دەمێك بوو سامی مردنم لێ ڕەویبودوە ، بەڵام لەوساتانەدا مەرگم بەئاوات دەخواست ، چونکە هەموو شتێکم چاوەڕوان بکردایە بەتەمای ئەو بێ‌وەفایی‌یەی دڵخواز نەبووم » •

جارێکی‌تریش هەستی‌کرد گەرووی وشك‌بوە وەك وشکایی بای سێ‌شەش • هاتە خوارێ • پەرداخێ ئاوی ساردی خواردەوە • سەرێکی حەوشەکەی دا چاوی‌لێ‌بوو لە کۆڵان ئافرەتێ پەلی منالەکەی ڕائەکێشاو پێی‌ئەوت : بەلەعنەت بی یاخوا بۆ وام لێ ئەکەی •

« رۆژانی دوای ئەو سەردانە سەختە ئەتوت بەر لەعنەتەکەی سیزیف کەوتوومو بە کۆڵ بەردم پێ ئەگوێزنەوە ، بەڵام بەرەبەرە وام‌لێ‌هات لەناخەوە هەست‌بکەم بە جیاوازی‌یەك • سیزیف لە هیچ هەنگاوێکیا هیوای سەرکەوتنی نەبوو ، بەڵام من لەگەڵ هەموو هەناسەیەکما هیوام بە سەرکەوتن زیاتر ئەبوو • تەنیا لە بوارێکی ئەم ژیانەدا نەم‌توانی بپەڕمەوە ، خۆ ئەمە مانای ئەوەنی‌یە ئیتر کۆتایی جیهانە ••• هاتمەسەر ئەوەی خۆشەویستی‌یەکەم لە دڵما زیندەبەچاڵ بکەمو بیر لە شتی گەورەتر بکەمەوە •

سەرکەوتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی • کەوتەوە خوێندنەوەی رۆمانەکە • پاڵەوانەکەی لە بەندیخانە بەربوو، بەڵام بەمەرجێکی سەیر ، وەك ئەو مەرجەی دڵخواز داوای لەم کرد• ئەمجارەیان پاڵەوانەکە بە سێ دەردی گرانەوە دەتلایەوە : یەکەمیان بۆ ئەو دۆڕاندنەی تووشی بوو کە ناچاربوو بە مەرجەکانیان قایل بێ‌و زیندان بەجێ‌بهێڵێ • دووەمیان بۆ چاوەڕواننەکردنی خۆشەویستەکەی کە بووبووە خەمێکی گەورەو گوڵاوی لاوێتیی ئەمڕی • سێیەمیان بۆ ئەو نەخۆشی‌یەی تووشی بووبوو کە بەهۆیەوە ناچاربوو سەرشۆڕبکات‌و هاوڕێکانی بەجێ‌بهێڵێ •

« منیش بەربووم ، دووساڵم تەواونەکردبوو کە دەرگای بەندیخانەکانمان خرایە سەر پشت • تیشکی خۆر هەورو تەمی لە سەرانسەری وڵاتا ڕەواندەوە • ڕووداوێکی گرنگی پرشنگدار بووە هۆی ئازادیمان • لەو خەمانەی پاڵەوانی رۆمانەکە تاقە یەك خەمیان تا ماوەیەکی زۆر خەوی لێ حەرامکردبووم، ئەویش بێ‌وەفایی دڵخوازو پەلەکردنی‌و چاوەڕواننەکردنەکەی بوو• کە من بەربووم ساڵێك بوو شووی کردبوو• زۆری هەوڵدا بمبینێ• پێم بەجەرگی خۆما ناو ماوەمنەدا • راسپاردەیەکی نارد ئەیەویست هەڵوێستی خۆیم بۆ ڕوونبکاتەوە ، بەڵام لای من بێ‌سوود بوو » •

لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی دەرەوەی کرد ، کوڕو کچێکی بینی پێکەوە ئەڕۆیشتن لە چاوەکانیانا خۆشەویستی‌یەکی بێ‌ئەندازە ئەخوێنرایەوە ، ئەم دیمەنە سەرلەنوێ هەژاندیەوە « ٢٥ ساڵە خۆم گرتووە • بە هیچ‌جۆرێك دڵخوازم نەدواندوە ، نەمویستوە بیبینم ، بەڵام ئێستا ناچارم ، چونکە باش ئەزانم کوڕە گەورەکەم‌و کچە گەورەکەی دڵخواز دوو ساڵ زیاترە دڵیان بەیەکەوەیە ، بەتەمان بۆ یەکتر بن ،

پەیمانیان بەیەك داوە ••• هەرچەندە من لە سەرەتادا ئەم خۆشەویستی‌یەم لا خۆش‌نەبوو ، بەلاّم لەئەنجامی لێك‌دانەوەدا هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە کچ بۆ دەبێ تاوانی دایکی هەڵبگرێ ؟ پیرۆزیان بێ • کاتێ من دڵم نەرم‌بوو ، لە پەشۆکاوی‌و هەڵبزرکاویی کوڕەکەما بۆم دەرکەوت کە ئەبێ پەڵەهەورێکی ڕەش بەری ئاسمانی خۆشەویستی لێ گرتبێ • ئەوەندەی بێ‌نەچوو کە پێم‌ڕاگەیاندرا ئەو پەڵە هەورە دڵخواز خانە بۆتە کۆسپ لەڕێگایانا • ئەیەوێ ئەم‌جارەش چزەم لێ هەڵسێنێ ••• ئەشێ بی‌یەوێ تۆڵەی ئەوەم لێ بسێنێ کە چارەکە سەدەیەکە نەم‌دواندوە ••• بە دڵ‌ڕەقم بزانێ ، وەك خوا هەقە خۆی دڵی لە ئاوریشم نەرمتر بێ • هەرچۆنێ بێ لەبەر دڵی کوڕەکەم ئەچم بۆ لای ••• باشترین هەلیشە داخی دڵمی پێ بڕێژم ••• پێی‌ئەڵێم : خانم تیرەکەت بخەرەوە ناو کەوانەکەی• دەست مەهێنەرە ڕێگای بەختیاریی ئەم دو دڵدارە • ئەو خۆشەویستی‌یەی تۆ کە جاران لە تاریکایی شەوەزەنگی بەندیخانەکەما چرایەکی خۆش‌گڕ بوو ماتەمینیی لە دڵم لائەبرد ئێستا لە دڵی « ئاسۆ »ی من و « ناز » ی تۆدا کڵپەی کردووە ، هەوڵی کوژاندنەوەی مەدە » •

دەستێکی بردەوە بۆ ڕۆمانەکە ، لەسەر خوێندنەوەی بەردەوام بوو تێگەیشت کە پاڵەوانەکە لەوکەوتنەیدا دەستەئەژنۆ دانەنیشتوە• هەستایەوە کەوتە پەلەقاژێ بۆ گەیاندنی دەنگی ئازادیخوازەکانی وڵاتەکەی بە هەموو جیهان ، لەگەڵ ئەو خەم‌و پەژارە زۆرەیا قینی لە کەس نی‌یە لە دوشمنان‌و چەوسێنەرەوان نەبێ • ئەیەوێ چارەکردنی نەخۆشی‌یەکەی بکات بە پردێك تا دەنگی خۆی بە خەڵکی بگەیەنێ • خۆشەویستی لە چاوەکانیا ئەباری • لێرەدا ئەمیش بەرەبەرە خۆشی‌یەك بە نەخشەی دڵیا ئەهات‌و بڵاودەبوەوە • کتێبەکەی دانا دەستی بە خۆگۆڕین کرد • بۆ دواجار لە

ئاوێنەکەدا سەیرێکی خۆی کردو بەرەو هۆڵەکە هاتەخوارێ • بە ڕوویەکی گەشەوە نیگای چاوەکانی بڕی‌یە کوڕەکەی وەك پێی‌بڵێ « بڕیارمدا دوای رق‌و قین نەکەوم • ئەو وشانەی ئەبوایە ڕووبەڕوو بـە دڵخوازی بڵێـم پێی‌ناڵێم • لە گوڵ کاڵتر لەڕوویا ناڵێم • خەمت‌نەبێ ئەو پردەی کاتی خۆی شیش‌بەندەکانی بە خەم‌و پەژارەی من بنیات‌نراو نەیهێشت بەسەریا بڕۆم، ئێستا بە گوڵە وەنەوشە بۆ تۆی ئەچێنم • دەسـت‌ئەدەمـە باڵی خـۆت‌و خۆشەویستەکەت تا بەجووتە بەرەو ڕۆخی کامەرانی بەسەریا بپەڕنەوە•• دڵنیابە کە پردی خەمت بۆ ئەکەم بە پردی وەنەوشە •

**سلێمانی ـ ئابی ١٩٨١**

---

مەنزڵگەی دیدەم ئاوپاشی گەردەن

چەشمەنداز بەرز بێ‌تۆزو گەردەن

شێوەت با بەیۆ ئەر مەیلش بارۆ

بەڵام بویەرۆ ئەر بـەد بویارۆ

**مەولەوی**

---

# دەفتەری باوەڕم بخوێنـــەوە !

**مارف عومەر گول**

بەتەنها بــووم
قەڵای دمدم لە ئەندێشەی شیعری سەوزما
باڵای دەکرد
دەیویست پەلی بۆ گەردنی شەوێ ببا
ڕێی پیرۆزی عەوداڵانی لێم وندەکرد
بەتەنها بــووم
بیابانو دارستانی ئەم گەردوونەم لێ ئاڵابوون
بیابان بەدەس سەرابی قرچەی هاوینەوە
دارستانیش بەدەس تەمی ستەمەوە
بەگوێی خۆمو گشت جیهانا دەیاننالاند :
« قەڵای دمدم ، لە گەرووی چەتەی رۆژو ڕێگردایە
دێرزەمانــە ،
بە برینی ستەمەوە
دەستی ئاخی بۆ دەستی مە رادەکێشێو هەڵوەدایە »
مانگەشەوی ئەو بەهارەی
هیواکانی ئێمەی لەسەر هەڵدەواسن

لە هەناوی گیانی سوورو لە هەنسکی ـ ڕێ ـمان دایە
بەتەنها بووم •• کوێرەماڵێك
کوێرەگوندو بەردەڵانی ڕێی دەوارێك
دەستیان گرتم •• چیرۆکێکیان گێڕایەوە :
ئەوەتی ئەم سەرزەمینە فراوانە دروست بووە
ئەو چیرۆکە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاددەکاتو
چی خراپەو وێرانکاریی زۆردار هەیە هەر دەینووسێ
نازانم کەی ،
ئەو چیرۆکە دەبڕێتەوەو کۆتایی دێ ؟!

* * *

بەتەنها بـووم
ویستم لەسەر شاخێکی بەرز وچان بگرم
قەڵای دمدم لە ڕوانینما
وەك شەوێکی پڕ ئەستێرەو ساماڵی گەش
بە ئومێدی بەهارمدا بشنێتەوە ،
نەگەیشتمە لووتکەی مەبەست
لووتکەی مەرام
لەدڵمدا بوو بە گوڵی سەدان هەڵبەست
بوو بە چڵی سەدان نەمام •

* * *

ئـەی براکەم
کلووی بەفر لە پەنجەرەیماڵمانەوە دێتە ژوورێ
ئای کە ماڵم بەفرستانەو

دەردی سەختی تەمەنێکی خەڵتانی ئاخ
بە فرمێسکی گۆنامەوە دەتکێتە سەر جومگەو پەنجەم
لە ئاقاری ڕوانینمدا ڕاناوەستێو
لە دەوارو لەناو کەپری کۆچەریان و ڕەوەندانی
ئەم زەمینە ژیلەمۆیەو پڕ ئاگرەدا •• دەبێتە گۆم
گۆمی فرمێسك کانیو ئاوی دامێن کەژی ،
ئەمسەر ڕێگای خۆشەویستو ئومێدمە
کانیو ئاوی ڕێی ئەوسەرم دەبێ چی بێ ؟!
گۆمی سووری ژیانمەو بەس !

★ ★ ★

ئـەی براکەم
تابووتی مەرگ بۆ پێشوازیم دەهێنن و هەر سڵ ناکەم
ئەژنۆم لەبەر گڕو مەرگی ڕێی پیرۆزدا
بە دەستی سوور چەپڵەی ئومێد لێ دەداتو
بەم کوردستانەوە بەندە ،
ئەی براکەم •• دە وەرە دەی
دەفتەری ئەم باوەڕەی من بخوێنەوە
بزانە چ ، هەڵبەستێکی ڕەنگاوڕەنگی ناخی گەشی مرۆڤێکی سەوداسەرە
یا گوێبگرە ،
با خۆم بێمو ئەو دەفتەرە بخوێنمەوە :
« بە پەیژەی برینی وڵاتما سەرکەوتم ، تا دیدەم
بارانی بەهاری لێ برژێ

بە سینگی شاخێکی سەختەوە ئەنیشکم نایە سەر
برینی سەر دڵێ
نەمدەویست بە پەنجەی زامدارم سیمای ئەو سوورتر کەم
برین‌و سیمایم خستە سەر شانم‌و بە تەکان مـلم‌نا
تا بڕۆم بگەمە مژینی هەڵاڵەی ڕێی ژینم •
نە کەسێ ڕەوتەنیم ئەم هەوار جێ‌بێڵم‌و
بڕۆم بۆ ئەو هەوار ،
نە داری بێ‌بەرم لەسەر ئاو فڕێم‌دەن
بۆ دۆڵی برینگ‌و وشکەڕۆ
نە وەرزی پایزی ساڵانم تا دەستی نەفرەتم لە ڕوو نێن !
گەڵای گشت ئەنگوستم وەرینە ڕووباری ئاوات‌و
جۆگەلەی هەنسك‌و ئاخمەوە
بتسمرم خۆ کۆرپەی باوەڕی میللەتم دەمینێ
خۆ چیای سەربەرزی مەڵبەندو هەوارم دەمێنێ
بولبولی ئاشقی ئاسمانی وڵاتم
جارجارێ هەر بەسەر گڵکۆما دەخوێنێ » •

کەرکووك ـ ١٩٨٠

# گورگانە شەوێ ...

محمد نوری توفیق

چوار دیواری ژوورێکی پەرپووت ئافرەتێکی نیوە بەسالاچووی گرتبووە خۆی .. خەڵکی گەڕەکەکە ئاشنای بوون و زوو زوو سەریان لێ ئەدا .. ئەم هەتا پێی بکرایە چاو بەرەوژێریان نەئەبوو .. هیزو توانای لەکارابوو قەرزاری کەس نەبێ .. چوار دیواری ژوورەکە شەواوشەو باوەشیان بۆ ئەکردەوە .. ئەمیش لە دەمی خۆی ئەگرتەوە بۆ هەردوو کیانی بەڕێ ئەکرد .. زووزووش بەسەری ئەکردنەوە . بێوەژن کۆشی یەکەی کارێکی‌وای کردبوو بێ‌باوکی‌یان لە ڕوودا نەبینرێ ... ڕێی دووریان بەلای ئەمەوە نزیك بوو ، گوێی بەوە نەبوو لەکوێ بن.. ئەوەندەش لەسەرخۆو هێمنانە میوانی‌یانی ئەکرد هاوسێو دراوسێ پەی پێ نەئەبردن ..

کەتازە لێی دوورکەوتبوونەوە بە مەبەستی هێنانەوەو ماڵپێکەوە نان دەمی شیرین ئەکردن :

— ڕۆلەکانم وا پیرو پەك کەوتە بووم .. بەزەییەکتان پیاما بێتەوە ، هەتاکەی بسووتێم و بێوەژن کوشیتان بۆ بکەم .. دە وەرنەوە سەرو

ژنتان بـۆ بهێنم‌و لە ســـێبەرتانا بحەسێمەوەو چاوم بە مناڵەکانتان بکەوێ • گوێیان لەئاستی قسەکانیا گران بوو •• داوای کـاری گەورەتریان لێ ئەکرد، هانیان‌ئەدا درێژە بە ڕەنجی بدات، خۆشی ئەمان لەوەدایە کەجارێ لە یەك دوور بن •• ئەشیان‌دایەوە بەڕوویا کە هەر ئەو تەنها دایك نی‌یە دایکانی وەك ئەو زۆرن ••

بە ناچاری ئەگەڕایەوەو بۆ ماوەیەکی دوور قسـەکانیان گوڕیان ئەدایە • تێ‌هەڵئەچووەو ، بەسەر ئەو ماڵانەیا ئەکەوتەوە گەڕ کە ئەرکی بۆیان ئەکێشـا ، ڕەنجی ئەدا •• سەرماو سۆڵەی زستانی تێکەڵ بە قرچەی هاوین ئەکرد •• لە سەردانەکانی داهاتوویدا وشەکانی ئەوانی ئەوتەوە :

ـــ هەرئێوە خۆش بن من باکم نی‌یە •• چاوەکانم‌و دڵمتان بۆ ئـەکەم بەدیاری • ڕێزی ئێوەیە خەڵـکی بە منی ئەبەخشنەوە •• دایـکی ئێوەم بۆیە سەربەرزم •• کەسەری ئەکردەوە بە ژوورە ســاردو سڕەکەیدا هالاوو بۆنی ئەوان گەرمی ئەکردەوە••گوێی لە هەوالیان ئەگرت‌و چاوی بە وینەکانیانا ئەخشاند ، هەرچی ماندوێتی لەشی بوو خۆی ئەشاردەوە •• ڕۆژ نەبوو لێوەکانی وێنەکانیان تەڕ نەکات ، فرمێسکەکانی شووشەی وێنەکانی قەتماغە کردبوو ••

ـــ دەخیلتان بم ئاگاتان لە سەرماو سۆڵەی ڕۆژگار بێ •• قرچە لـە جەرگمەوە هەڵئەسێنن •• ئاخ خۆزگە ئێوەش وەك من جەرگتان ئەبوو ئەوسا ئەتانزانی جەرگ چەند سەختە •

گلێنەی چاوەکانی لەمیان ئەکردەوە ئەینا بەویانەوە •• لە گۆران•• لە سۆران •• ئینجا لە سەر گۆرانی دائەنا :

ـــ زۆر سەرچڵی •• بزێوی منداڵیت هەرپێوە دیارە •• زۆرت لـێ

ترساوم •• توخوا لەمە زیاتر مەمسووتێنە ! •

فرمێسکەکانی سڕیەوە ••• بەشەرمێکەوە وتی :

— توخوالێم مەگرن ••• چیئەبوو ئێوەش وەك ئەم خەڵکە ماڵێکتان پێکەوە بنایەو ژنتان بهێنایەو سەرو ماڵی جوانتان بوایە •• ئەوسا با شامەرگ بوومایە ••• هەردووکیان بە یەك دەنگ وەڵامیان ئەدایەوە :

— بەزمەکەیە هەمیسانەوە ! •• ئەی بەڵێنت نەداینێ کە واز لەم قسانە دێنیت ؟ • ئیتر ئەم قسانە بکەیت لێت عاجز ئەبین ••

وەك پەشیمان بێتەوەو دڵیان بداتەوە ، ئەیوت :

— ئەی نابێ گاڵتەیەکیشتان لەگەڵدا بکەم •• بەبیرتان دێ کەمنداڵ بوون هەزار گاڵتەم لەگەڵتانا بکردایە تووڕە نەئەبوون •• ئای خۆزگەم هەر منداڵ بوونایەو بە گورگانەشەوێ خەوتان لێ بکەوتایە ، بەبیرتان یەت کە شەوان گورگانەشەوێم بۆ ئەکردن •• بەیەك دەنگ ئەتانوت ، دایکی وەك تۆمان هەبێ هیچ گورگێك حەدی نی‌یە بمانخوات ) •• منیش پێم‌ئەوتن ( وەڵا گورگی واهەیە منیش‌و باوکیشم ئەخوات ) یەك دەنگتان لێ بەرز ئەبووەوە ( ئەوە گورگە هارەیە ، گورگە هارە چل شەوی عومرە ) • سەد هەزار خۆزگە هەر منداڵ بوونایە •• ئای گورگانەشەوێ خۆشە، ئەمجارە بچمەوە بە میوانیان گورگانە شەوێیان بۆ ئەکەم •

( گورگانە شەوێ بڕۆ •• بڕۆ •• بڕۆ •• کێ بخۆ •• کێ بخۆ ••• ؟ ئا بڕۆ ئەو بخۆ •• مەیە گۆڕانو سۆران بخۆی ••• گورگانە شەوێ بڕۆ ئەویش بخۆ •• ئەویش •• ئەویش •• هەموو

ئەوان •• بڕۆ دێو بخۆ •• درنج بخۆ •• هەموو دڵڕەقێکی سەر ئەم زەوی‌یە •• هەموو خوێن خۆرێك •• هەموو پیاو خراپێك بخۆ ••• مەیە گۆران‌و سۆرانی من‌و هاوڕێکانیان بخۆی ••• وەرە خۆم بخۆ •• توخوا ئەوان مەخۆ •• گورگانە شەوێ •• گورگانە شەوێ •• گورگانە شەوێ ••• )

وەیشومەو بەفرو باران‌و ڕەهێڵەیەکی توندو تیژو ڕەزاگران دامێنی چیای داگرت ، زریان‌و هەرەسی بەفر لاشەی گۆران‌و کومەڵی هاوڕێکانی وشك هەڵگەڕاند •• هەموو تەپێنرانە ناو عارەبانەیەکەوە بەرەو مەڵبەندی مناڵی‌یان •• لە نزیك گۆڕستانی‌شارەوە لە چاڵێکا بە وێنەی قوتووی ساردین ڕیزکران‌و خرانە ژێر گڵەوە•• بەیانی کاتێ زریان‌و وەیشوومە کڕبووەوە هەر دایکێ بە چرنووك لە چاڵی جەرگی خۆی نەوی‌و هەریەکە لە چاڵێکی دیاری‌کراودا بەڕیز ناوەکانیان لەسەر چاڵەکان نووسی•• یەکێکیان گۆران‌و یەکێکیان هێمن •• یەکێکیان دارا •• ناوی سۆرانیش خەتێکی ڕاست‌و چەپی پیاهێنرابوو ••

دایکە لەگەڵ شەوگارا دەستیان خستە یەقەی یەکتری •• ئەم بە گریان‌و نزاو پاڕانەوەو ئەویش چنگی تاریکایی خۆی لە بیناقاقەی شارێکی داماو توند ئەکرد ، لەناو کەللەسەری ئەمیشا ناسازترین ئاوازیان تێکەڵ ئەکرد •• پێ‌پەروا دەستی ئەنا بە پلاکی گڵۆپی ژوورەکەیداو ئەیکوژاندەوە •• لە کاتێکی چاوشارکێی گڵۆپەکەدا هەر سۆران ئەهاتە قسە :

( دایکە چۆنت دی هەر وایە ، هەر کاکمەو من نیم •• من ماوم ••• ماوم •• ) لە گۆران ئەپاڕایەوە ئەویش دڵنیای بکات •• ئەم وشە لە قوڕگیا تاسابوو ، تەڵەی دەمی نەئەکرایەوە •• چاوەکانی شووشە بوون

گیانیان لێ بڕابوو •• پەنای بۆ ئەبردەوە ، هانای ئەهێنایەوە بەری کــە
پێی بلێ ئەوی بە چاوی خۆی دیویێتی درۆیە •• بێ‌باك بوو ورتەی لێوە
نەهات بە ناچاری پەلاماری دەرگای ژوورەکە••• پەنجەرەکەی ئەدایەوە
بۆ دەنگێ ، رەنگێ ، هەواڵێ•• لوورەی باو سەگ‌وەڕەکە ژوورەکەی پڕ
ئەکرد •• دەرگاو پەنجەرەکەی داخستەوە •• گریان‌و هاوارو فـوغانی
تێکەڵ بە تاریکایی شەوکرد •• باڵ‌کەوتەوە •• هەڵسایەوە •• ئەگریا••
لە خۆی ئەدا • چەندێ ئەم کردی شەوگاریش بەرپەرچی ئەدایەوە ••
شەوگار درێژ ئەبووەوەو ئەم لێی ئەقرتاند • • تـا لـەدوایـیدا دڕی بـە
تاریکایی‌یەکە داو دەنگی مەلای بەیانی خامۆشیی شاری ڕەواندەوە، چاوی
خەوی لە سەدان چاو فڕاند ••لە چێشتەنگاوی ئەوڕۆژەدا پوورە گوڵـە
چاڵێکی‌تریشی لەتەنیشت گۆڕانەوە بۆ سۆران لە جەرگی خۆی هەڵدڕی‌و
ناوی لەگەڵ ناوەکانی‌تردا ڕیزکرا •••

---

ترسنۆك ، بەر لە مردنی ، چەند جار ئەمرێ

شەکسپیر

---

# کۆچێکی ڕەشپۆش

حەسیب قەرەداخی

١ ـ هەی داد ، هەی داد شەو درێژە
هەی داد ، هەی داد ڕەقیب بەسە ..
داخی دڵتم پێ مەڕێژە
منم لەژێر باڵی شەوا هاوار ئەبەم بۆ خەیاڵم :
دڵی خۆتم بۆ هەڵرێژە
ئا دەی لە ناخی تەقیونا پەیامێکم تێهاوێژە
خەمێکی کەیشمت ئەدەمێ ..
لەناو زەبەندی گێژاوتا
نەمامی نوێیە بینێژە :
بەستەی باومان هەتا ئەمڕۆیش بمانەوێو نەمانەوێ
( فەتەڕۆ )یەکی بێچێژە !

٢ ـ پایـز سـاردە
هەورێکی زۆر خڕۆڵەمێشین ، سام لێ نیشتوو
بەری ئاسمانی گرتووە

دەستی ناوەتە سەر دەمی ئاسۆی ئەملاو ئاسۆی ئەولا
کات بەیانە ، ئەوا خەڵکی
لەسەر حەوزەکەی خانەقا دەستنوێژ ئەگرن
مەلایەکی‌تر پێش‌نوێژە

٣ ـ سەدو چل ساڵێك لەمەوبەر
مـلا خدر :
عەبایەکی دا بەشانداو لە ژوورەکەی هاتەدەرێ :
[ ئـەلا ئـەی نەفسی بووم‌ئاسـا هەتا کەی حیرصی وێرانـە
لەگەڵ ئـەم عەشق‌بازانە بـڕۆ بازانە ، ئازانە ! ]
چەند فەقێ‌یەك لە خانەقا بەڕێیان‌کرد
هەتاکو ( وەیس )
هاواریان کرد :
وشەی کوردی ماڵوێرانە
شارەزووریش بێ‌بابانە
( نالی ) ئەڕوا ، هەوار دوورە
کەچی خاکمان لە کاغەزی هەندەراندا
هەتا ئێستەیش بێ‌سنوورە
لە ئەشکەوتی هەزارمێردا ، هاوار هەڵسا
( پیرەمەگروون ) دای بەسەرا
لە شارەزووری بێ‌چرا شەو باری‌خست .
بڕۆ ( نالی ) ، بڕۆ ( نالی )
هۆ خەڵکینە ، بۆ نەتان بیست ؟!
هۆ خەڵکینە ، بۆ ئەوشەوە گرانەتا کەوتە ناوتان ؟!

هۆ خەڵکینە ، بۆ ئەوشەوە خەوی مەرگیش چووە چاوتان ؟ !
( نالی ) ڕۆیی و کەس هەڵنەستا ،
کە ڕۆژ هەڵهات و گشت شتێ ئاشکرا بوو
دەرگای بەبە مۆرکرابوو
ئەوسا دەستتان دا بەدەستا ،
هاتن و چوون
بۆ نەبووبوون وا هەر نەبوون ؟
هۆ خەڵکینە ئەوا سەدو چل ساڵ ئەبێ
لە شارەزوور ، سەری حەبیبە هەر شینە
لە هەرکەسێك داوای خەوێکی ( نالی ) کەین
ئەڵێ هەڕۆ ، هەڕۆ نینە .

٤ ـ بڕۆ ( نالی ) ، ( نالی ) بڕۆ
تەختی شارەزوور بێتاجە
کە شارەزوور تاجی نەبێ
شاعیریشی بێڕەواجە

٥ ـ داربەڕوویەك هاتە ڕێگەی تاکوو سێبەری تو بکات
وەشتێك بەسەر قەرەداخدا
کەژاوکەژ هات خۆی دەربخات
لە کۆچەڕێی ( مەولانا ) وە
تۆزی ڕێگە هاتەدواوە :
( نالی ) بڕۆ ، بڕۆ ( نالی )
دامێنی خۆت بشۆرەوە

له ( ئاوباره ) مەخۆرەوە ،
سەرچاوە پیس و وێرانە
وەرزی خەمی ئاودێرانە
قاتی ساڵی وەرزێرانە
( نالی ) برۆ ، ( نالی ) برۆ
تەختی « ئەحمەد پاشای » ی بەبە سەرنگوومە
« سالم » قافیەی شێواوە
« کوردی » قالەی دەرکراوە •• کۆستەکە ئێجگار قەبەیە
« مەحوی » ئەڵێ :
[ له دڵی من ئاشیفتەتر تەنها ولاتی بەبەیە ]
برۆ ، جگەرگۆشەکانت
بخە باخەڵ و گیرفانت
دەست و پێیان لەگۆ ئەخەن
بە فووی ساردی مەعنای خراب ، تەشەری تاڵ ،
شتی سەیریان ئەدەنە پاڵ
( نالی ) برو ، برۆ (نالی )
خەنجەرەکەی « ئەحمەد پاشا » له کێلاندا خنکێنراوە
ئەگەر شێخی ئاوباریکم نەدیبایە
من هەر ئەم وت شکێنراوە !
« سالم » هەر له ( دێوانە )یە
تەمی شاخی ( دارمازەڵە )
بە چاوی ئەو پێوانەیە
ئەستێرەکان لەپشت کێوی ( سەگرمە )وە
وا لاڵ و پاڵ هەموو خەوتن

جەندرمەکان لە ( شێخ حەسەن )یان نەپرسی
کە سەرکەوتن
کتێبخانەکەی « شێخ لەتیف » ئاگر گەیشتە دامێنی
« سالم » ئیتر چۆن ئەمێنی

[ لە ئەسلا بانی‌یی ئەم کارە کاسبهایـی شەهری بوون :
لـە ئـەمری فیتنەئەنـگێزا سەراسـەر میثـلی مەردانن
لـە ئـەوزاعی سلێمانی ئـەوانـەی شـادو ئاسـوودەن
لـە فەرعا نوتفەیی حیزن ، لە ئەسلا جینسی شەیتانن
گەهێ هەمدەردی ئەکرادن، گەهێ هەمعەیشی ئەتراکن
لـە یەکلا مادەری بەرخن ، لە یەکلا یاری گورگانن ]

( نالی ) بڕۆ ئازار تا کەی !
( نالی ) ئیتر چۆن کۆچ ناکەی ؟!
لە غوربەتێکی دوورەوە بەکوڵ بگری
بۆ خانەقاو مەولاناکەی

[ سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو خانەقا بکە
ئایا ڕەبیعی ئاهووە یا چایری ستوور ؟ ! ]

٦ ـ هۆ ( شیخ ڕەزا )
تۆ لەبیرتە سلێمانی کە دارولمولکی بابان بوو ،
کە مەیدانی جریدبازی لە دەشتی کانی‌ئاسکان بوو
بۆ ئەربابی حاجەتەکان ،
مەتاف هەر گردی سەیوان بوو
ئەی بۆچ لەبیرت‌نەماوە ،

چۆن کاول و چۆن وێران بوو ؟!! ،
خاکی بەبە ، دڵی هەموو ئالی بەبە
کولبەی تەنووری ئەحزان بوو
کەچی مێژوو هەر فاتەکەی سەر گردەکەی سوورەبان بوو !

٧ ـ ( نالی ) بڕۆ •••
دەستی مەرەکەباویت پاك بشۆ
( نالی ) کۆچ کە ••
چونکە لەدوای ئەم کۆچەی تۆ
باوی کۆچە

[ کۆچ بوو بە نانم ، کۆچ بوو بە بەرگم
کۆچ بوو بە نەشتەر درا لە جەرگم ]

گوێ ڕاگرە ، شاعیرێکی ئەم سەردەمە
کۆچنامەی نوێی نووسییەوە
کە تێم ڕوانی ، زۆر ئاشکرا
کۆچەکەی تۆم تیا دییەوە

[ لەسەر پشتی ئەسپی قەترانیی ئەمشەوە
کۆچ و باری هەرچی دڵداری ڕەوەندە دابەستراوە
گۆرانییەك لەسەر زاری لق و پۆپە •••
ڕەنگ دانەوەی لە ئاسۆدا ، لەناو سینەی چەمەکاندا ••
ئەبنە چیرۆك •• ئەبنە داستان ]
شاعیرێکیش وا بانگ ئەکات ••
بۆم نابڕێ دە وەرە تۆ ••

[ شەو درێژە •• ڕێی بێداری بێهاوڕێیە ، نابڕێتەوە •••
وەرە ئەی خەم لەسەر مێوم ••• لەسەر چاوم
نەبا غەریبێ جێت بگرێ ! • ]

تۆ دێیتەوە •••
وەکوو گوڵی شیعرەکانت
ئەکرێیتەوە ؟ ! •
( نالی ) کۆچکە ، کۆچ گرانە
تویش بۆ باری گران چاکی
چونکە پاکی ،
چونکە تاکی !

٨ ـ مەیەرەوە
چونکە خەڵکی پرسیش دەکەن
چیتانلێکرد لە تەختەکەی « ئەحمەد موختار »
بۆ تەختی « بابان » چیتانکرد ؟
بە پیلانی کاسبهای شار ڕێتاننەبرد ! •
ڕۆمی بەڵای ناگەهان بوو
ڕۆمی پەتای بێئامان بوو ••
هەمووی کوشتن ،
« ئەحمەد »یش مرد
« ئەحمەد پاشا » و ئەحە کەچەڵ هیچیان نەمان
تاوان لە کۆڵی کێدایە ؟••
ئەحمەد ، ئێوە ، مێژوو زەمان ؟!
ئەگەر وەڵام نەدەیتەوە

دەروونی خۆت ئەخۆیتەوە
کە وەڵامیشت دایەوە
مۆرکی ڕاپۆرتی لێ ئەدەن
هەزار جنێوت پێ ئەدەن
مەیەرەوە
لە کۆچی دووری بێ‌پەیتا ..

[ تۆ باقیەیی ساقیەیی صەحنی چەمەن بە
مەیدان هەموو مەیدانە بە کاساتو بە طاسات
( نالی ) یەکو ئەوکەس کە تەمامی غەزەلی بیست
مەعلوومی بووە زۆرو کەمیی خاریقی عادات ]

٩ ـ لە سەرشەقامو خانەقا ...

بەناو گەرووی رەشەبادا ئەڕوانمە لووتکەی ئەزمڕ ،
هەموو سەر لە بەیانییەك دڕن‌ئەدا بە تاریکە
وەکوو یەکەم بڵێسەی گڕ
هەتا ئێستەیش « ڕیچ » ئەبینم
ریچ وەستاوە لە پێچەکان
کاغەزی شێخ وەردەگرێو
دەرمانی پیس بۆ واریسی تەختی بەبە ئەگرێتەوە
تلیاك ئەکاتە قەندەکەی مەولاناوە
دەمانچەکەی دای بە پاشا
پاشا ئەکوژێ لە پەناوە .

١٠ـ هۆ مەلکەندی ، هۆ خانەقا
هۆ شێخ هەباس .. هۆ کانی با
بە بادەکەی خۆش‌مرووری نالی بڵێن
سەری بگرێتە خاك‌وخۆڵ
خەمێکی زۆر بگرێتە کۆڵ
لەولاتی نالی‌یەکانداو لەلای نالیی ولاتەکان
شتێك گۆڕراو جەمسەری کار دۆزرایەوە
لەلای ئێمە ، لە کۆچەکەی نالی‌یەوە
بەستەڵەکی شەوی سەدوچل ساڵەمان نەشکێنراوە
لە سێبەری داربەڕوودا
کاسەی دۆیەك نەخورایەوە قۆچی قەوی بۆ نەکرابێ
کووپەکمان هەڵنەبچڕێ
هەزار پەنجەی تێ‌نەخرابێ
هەناوێکمان لە ناخ نەگرت
هەزار زامی لێ نەکرابێ
ڕەشبەڵەکێکمان سازنەکرد
بە لیتەی جێ هەڵپەڕکێمان
سەرمان لە قۆڕ نەگرتبێ
مەرحەبایەکمان لێ نەکرا
دەستمان بۆ دڵ نەبردبێ
( نالی ) بڕۆ .. کۆچ تا سەر بێ
قۆچ با سەر بێ
نالی کاتێ پاك‌و چاکە دەربەدەر بێ ...
گۆڕی نەبێ ، ..
چۆڕی نەبێ ! .

# دووربـــین

**محەمەد فەریق حەسەن**

ئاوەکە ، کاتێ بەگوڕ دەیدات لە بەردە ئاوەسووەکانی ناو چەمی باسەڕە، بە بالآیاندا هەڵدەشاخێو خوڕەیەکی ئاوازداری لێ هەڵدەستێ•• ژاڵە سوورو •• سپی‌یەکانی هەردوو ڕۆخی چەمەکە ، بە شنەبا حاڵیان لێ‌هاتووە •• خۆرەکەیش وەکو هاوڕێکانت لە ئاوەکەدا مەلەدەکات •• تیشـکەکەی لـە گـۆمەکەدا دەشـکێتەوە ، تابـلۆی شـێوە کریسـتاڵ دەنەخشێنێ •

زەرفی نایلۆنی هەمەڕەنگت لێوە دیارە ، هــی سەیرانکەرەکانــی دوێنێ شەوە ، بە زریسكو بنچکەکانەوە عاسی بوون • بوتڵی شکاو ، قاپی سەفەری •• شوێنی ئاگرەکەیان ڕەش‌دەچێتەوە •• بــە شەوقــی لۆکسو ئاوازی ڕیکۆردەرو گەڕەلاوژەیــان ، ئاوەدانی‌یــان خستبووە ئەم دەورو ناوە •

ئەو جمو‌جووڵە لەپڕە دنەی‌دان شوێنەکە تاقی‌بکەنەوە •• کاتێــك بەخۆیان زانی لەژوور ســەریانــەوە وەســتاون • وەك برا بن‌و چەند ساڵێك بێ لێك‌دابڕابن ، تێر ئەم‌لاو ئەولایان ماچ‌کردن •• ئــەوان لــە

جەنجاڵی‌و پەژارەی شار خۆیان دزیبۆوە •• چاوت تێوەبوو شەرم دایگرتبوون‌و شووشەکانیان کرد بەژێرەوە خوڵکی ماسیی برژاویان کردن •• چەند گوزەرانێکی پڕ لە ڕووداوی سەیرە ؟!• هەر ژەمەو لەسەر خوانی خانەخوێیەك •• پێت‌خۆش‌بوو شووشەکانیان شاردەوە•• لە سەرێکی دیکەوە شووشە مل‌باریکەکان مەیلیان نوێ کردیتەوە •• لە دەروونتا مارێکی نەوسن کەوتە سەرەتاتکێ !••

هەر لەوێوە ، قولاخی ئۆتۆمۆبیلە زەبەللاحەکەت چاولێیە • • ئەوەتا لووتیان پێ داژەندۆتە گۆمەکەوە • لەم دیمەنەدا جێ‌دەستی دەستەیەك لە هاوڕێکانت دەبینی• ئەوەتا لەبان پلێتی بۆدی‌یەکەیەوە شڵپ خۆیان هەوادەدەنە گۆمەکەوە ••

ئەو شوێنەی لێی وەستاوی ڕوانگەیە • بەرزایی‌یەکەی دە مەترێك دەبێ • لەوێوە بەتەواوی بەسەر دەوروبەردا زاڵیت‌و دەستت درێژە•

جادەیەکی قیرتاو لە ڕێگای سەنگاو جیادەبێتەوەو سەرەوژوور بە پێچەوانەی ئاوەڕۆی باسەڕەوە هەڵدەکشێ ، تا بەردەم ئەم گردە دێت‌و دەکوژێتەوە •• لێرە بەرەوژوور باریکەڕێ‌یەکە ، بە ڕۆخی ئەم چەمەدا ڕووەو دەربەندەکە هەڵدەکشێ•• ڕێگەکە لە هەورازەو ڕووبار لەنشێوە•• جێ‌جێ تاوێرەو جێ‌جێ زیخەڵانی •• هەندێ شوێن زەق‌و زۆپە ، ڕێبوار ئاشکرا دەکات‌و برێ‌جاریش ڕوو لە چاڵی‌یەو دەیشارێتەوە •• تا خۆی دەکات بە زاری دەربەندەکەداو لەوێ خۆی قایم دەکات •

ئەو تەپۆڵکەیەی کە لێوەی دەڕوانی ساڵگارێك بەر لە ئێستا ، بۆسەیەك بوو ، ئەم دەورو ناوەی دەخستە ژێر چاودێریی خۆیەوە • ئێستاش ماوەتەوە سەر چەند پایەیەکی کەل‌وکۆم‌و داڕووخاو ••

دووربینەکەت لەو پێویستی‌یانەیە کە لێت جیا نابنەوەو ، بۆتـــە بەشێك لە گیانت • لەدوورەوە یـارو نەیاری پێ جیا دەکەیتەوە •• دەزگایەکە زوو لە دەوروبەر ئاگادارت دەکات ••

ئەوا دەنگێکی ناساز ، لوورەی گورگ ئاسا ، دووربینەکەی پێ بەرزکردیتەوە••• چاوت گێڕا•• دوو فڕۆکەی بارگواستنەوەن ، لەئاستی ژاڵەوە بۆ سەر چیا ، تاپۆی جووتێك واشەیان ماوەتەوە •• کاروانێکی ئاسایی‌یە ، هەفتەی چەند جارێك بەو ئاستەدا ڕەت‌دەبێ ••

گەرماوەکەت لە هاوڕێـکانت تێك نـەداو ئاگادارت نەکـردن •• باسەڕە ئەگەرچی چەمی پێ دەڵێن ، بـەلام بـە هاژەو تافەتـاف منـەی ڕووبارێکی سەرەڕۆ دەکات‌و بەهاران گا دەفڕێنێ ••

هاوڕێکانت برێ جار گەرماوەکەیان لێ دەبێتە گاڵتەی منـداڵان • هەرچەند ئەوان هیچی وەهایان لە قۆناغی منداڵی هەڵنەبـواردووە •• ئەوەی لە هەمووتان بە تەمەنترە ( سەردار )ە ، بە مام سەردار ، بانگی دەکەن • تەمەنیشی تەنها بیست‌و حەوت ساڵە • ئەوەتا لەپاڵ تاوێرێکدا هەڵتروشکاوە ، سەرنجی ئاسمانی بان چیاکە دەدات • لەوە دەچێ ئەویش دەنگە ناسازەکەی بیستبێ •• ئەوا جووڵاو بۆ بەرزایی‌یەکەی بەرامبەری دەچێ•• نە وەکو ئەوانی‌دی قرەقرو گاڵتەو مەزاق دەزانێ‌و نە نوکتە گێڕانەوە ••

سەرەتا باوەڕت پێی نەبوو بتوانێ بزنە شەڵێك گل‌بداتەوە •• کەچی لە هەموو تەنگانەیەکدا کە چاوت بۆ گێڕاوە لەپێشتەوە بووە••• لەدوای هەمووشتان شەڕگەی چۆڵ‌کردووە •• لـێرەوە بـۆت دەرکەوت کـە بوێری‌و کەڵەوەکێشی بە ڕەنگ‌و ڕوو نی‌یە ••

هاوڕێکانت دەڵێی ئـەو باڵندانـەن کـە خـۆیان بـەدەم شـەپۆلی ڕووبـارەکانـەوە دەدەن •• شـڵپو هـووڕ ، دەنـگو قریوەیـەکی هەرزەکارانەیان لێ بەرزدەبێتەوە ••

دووربینەکەت بە چاوەوە نا • بەرەوخوار بە جادە قیرەکەدا ڕوانینت دەنێری •• سەرنجت لەسەر کەندەڵانێـك لەنـگەری گرتـووە • وەك ئێسکە پەیکەری داینەسوورێك ، کۆمەڵێك ئاسنی تێك‌پەڕیـوی ژەنگ خواردوو ، لاشیپانی دەرگای ڕزیوو تێك‌قوپاو ، خۆیان کرد بە چاوی دووربینەکەتدا • لە گیاندارێکی زەبەللاح دەچێ داڵ لێیدابێ ، تەنیا دارو بارەکەی ماوە •• بیرت چۆوە بۆ ئەو بەیانی‌یە بەهاری‌یەی کـە وەك بارگیرێکی چەمووش تیایدا گلاو سەرەنگرێ بوو •

★ ★ ★

تۆ لە شانی مام سەرداروە لە پەنا بەردێکدا بووی کاتێ دەنگەکان تێکەڵ بە نرکەی باسەڕە دەبوون •• ئەو حەلە باسەڕە هەڕەتی شەپۆلانی بوو • چاوت لێ‌بوو ئەو عەزیایـە ، بـە تەپاوتل‌و تەقلـە لێدان ، بـە خەرمانێك گڕەوە ڕووەو چەم دایکێشاو بە یەکجاری لە کەندەڵانەکەدا شانی دادا گڕێکی سوور وەك زمانی گورگ لە پێشی‌یەوە دەهاتە دەرێ ، وردە وردە تەنی‌یەوە ، بە تەقینەوەیەکی گوێ کاس‌کەر ، لەبەر تۆکمەیی خۆی ، ئەوناوەی هەژاند • پەڵە هەورێك دووکەڵی قیرین چوو بـە ناخی ئاسماندا •• قوڕقوشم زەردەزیڕەی ورووژاو بوو ، گیزە گیز بە چوار کەناردا بۆ سیپەو پەنا دەگەڕا • ناو بەناو گرمەیەك ، زەوی‌یەکەی ژێرتانی دەلەرزاند • سووکە شانێکی بەو گابەردانەیشـی هەڵدەتەکاند کە لە سەردەمی ساوایەتیی گەردوونەوە چەسپی زەوی بوونو لەرەیان بۆ نەکردبوو •

ڕێ‌دەکەوێ کەڵەشێرێکی بچکۆلەی باڕ یەکێکی جقەدرێژ نەبەزێنێ •• هەڵۆیەکی گچکە سەرگەڕێك لە حەواوە بەردەداتەوە •• زۆرانەکەی ئێوەیش وەهابوو •• هەربە گلاندنی عەزیاکەی پێشەنگی کاروان کە بەعینوان دەهاتەڕێوە ، سەرگەڕ بە پەلەپڕووزێ لە چنگی هەڵۆی پەڕکوور دەرباز بوو •

★ ★ ★

ڕووت وەرچەرخاند ، دەربەندت هێنایە بەردەمت • تاكو تەرا دەوەن ، لێرەو لەوێ ، خۆیان بەو چیا بەردینەوە هەڵواسیوە • جەڵەبە بزن ، بە دامێنەوە ڕووەو پادەشت سەریان ناوە بەدووی یەکەوە •

چاوەکانت گەیشتنە زاری دەربەندەکە •• زاری دەربەندەکە لە یەخەی بلووزەکەی ( کەژاڵ )ی پوورزات دەچێ •• گەڕایتەوە بۆ ئەو ڕۆژەی پێکەوە لە سای دەوەنێکدا دەمەتەقێتان بوو ••

★ ★ ★

ـ « ئەرێ کاوە ، قسەیە بکەم پێی دڵتەنگ نابی ؟ »

« جا من کەی بە قسەی تۆ دڵتەنگ بووم کەژاڵ • بیڵێ ! »

ـ « دەڵێم : چەندم دەکرۆشا باوەڕم پەیدا نەدەکرد کە تۆ بەم چیاو چۆڵەوە گوزەران بکەی‌و هۆگری ببی ! »

ـ « دەی دەی کچی باش ، تمەس کاتی خۆی باوەڕت‌پێیم نەبووە ؟! »

ـ « نانا وام نەوت کاوە گیان • ئاخر تۆی قوتابی‌و دەست‌و پێ سپی ، هەموو پێویستی‌یەکت هاتۆتە بەردەست •• مەگەر بۆ سەیران چیات دیبێ ، ئەی وا نی‌یە خاڵۆزا ؟ »

ـ « گرنگ بڕوابوونه بەو کارەی کەمرۆڤ دەستی دەداتێ ••
کە بڕوای هەبوو ، ئیتر هەموو شتێـکی لە دەست دێ کەژاڵ
خان • • »

ـ « ئەگەر بڵێی قوتابی‌یەکانی هاوڕێشت سەریان سوور دەمێنێ کە
دەڵێم هەمیشە نزیکەی بیست کیلۆی بەکۆڵەوەیە ! »

ـ « جا دەڵێی چی ؟• شوو بە کۆڵ بەکۆڵ دەکەی ؟ »

ـ « ڕاستی‌یەکەی دوای ئەوەی هۆڵی خوێندنت چـۆڵ کـرد ،
منیش ئـەوەی بە شوێنیـدا دەگـەڕام دۆزیمـەوە !• گفتم
پێداوەو بڕاوەتەوە !! »

ـ « ئەو بەختەوەرە کێیە پوورزا ؟ »

ـ « خاڵۆزامە ! ! »

ـ « ئەی شەیتانی چاوشین •• فـێری قسەکردنیش بـووی !••
ئەوەخەریـکی چیت ؟ »

ـ « ئەم ئەستێرەیەی قۆناغی داردەستەکەت تـۆخ دەکەمەوە ••
بام لە دوورەوە وەك ئەستێرەی ئاسمان بدرەوشێتەوە •• »

ـ « جا بە بۆیەی نینۆك ، کچی باش ؟! »

ـ « ئەی بۆ نا •؟ لەبەر دوو شت •• »

ـ « چی‌و چی ؟ »

ـ « یەکەم : تاکو لەیادم نەکەیـت •• دووەمیـش : تاکو ئـەم
داردەستەت بەقەدەر من خۆش بوێ !• »

ـ « قسەکانت خۆش بوون پوورزا •• بەڵام هاوڕێکانم بزانن بە
بۆیەی نینۆك ڕەنگ‌کراوە لێم نابڕنەوە •• ئەوان بەزۆری
گەرمیانین !• »

ـ « ئاخر نەبادا منیش‌و داردەستەکەیشت لەیاد بکەی ! »

ـ « هەرچەند بەم دەربەندەدا ڕەت ببم دێتەوە یادم •• لە یەخەی بلووزەکەت دەچێ ! »

★ ★ ★

سەرنجی گۆمەکە، دەدەیت• فەرەیدوون خۆی ڕۆشتە کردۆتەوە••• پەیکەرێکەو لەسەر تاوێرێك ڕاوەستاوە • لاوێکی تێکسمڕاوی بازۆڵە پتەوە • بە ئارامەو پشوو درێژ ••

هەڵسایتەوە ، چاوی دووربینەکەت کردەوە دەربەندەکە • تاکە سوارێك تازەکی لە گەرووی دەربەندەکەوە بەمدیودا دێت • سەڵتە زەلامێك جڵەوکێشیی دەکات •• کەوتیتە دەستکاریی بەکرەی دووربینەکەو بە ڕوونی دەربەندەکەی بۆ هێنایتە بەردەم• بەڵام ڕێبوارەکان کەوتنە نشێوی • دەسووڕێیت‌و چاوەکانیشت هەر بە دووربینەکەوەیە •• جم‌وجووڵێکی ئەوتۆ بەدی ناکەی •• پادەشتەکەیش هیچ هەستێکی نوێت پێ نابەخشێت • بۆیە دووربینەکەت بە گەردندا شۆڕکردەوە ••

شیروان لە ڕۆخی گۆمەکە چیچکەی کردووە • هێشتا خۆی ڕووت نەکردۆتەوە• ئاوێنەیەکی خڕ لە قولی مستداو بە مووکێش خەریکی چاك‌کردنی ریش‌و سمێڵێتی •• شیروان هەمیشە دەست بەخۆیدا دێنێ • ئەو کوت‌ومت دەڵێی ( کاروان )ی براتە •• وا بیرت بووە مەلێکی باڵ سووك‌و بۆ جەنجاڵی‌و گوزەرانی شار هەڵفڕی ••

★ ★ ★

کارە ، وەکو لەماڵەوە بانگی دەکەن •• کاروان ، کاروانی حەمەتەلی • قەڵافەتی لە تەمەنی گەورەتر بووە• پیشە خورماییەکەی،

جۆره سامێکی دابوویه •• ئەگەر بەلایدا ڕەتبوویتایـە ، هـەر دەبـوو ئاوڕێکی لێ بدەیتەوە •• چاوەکانی وەك چاوی نـێرگز بـەلای زەرددا دەیانڕوانی •• هەمیشە ئارەزووی لە جلوبەرگی ڕەش بوو •• پشتوێنێکی پانی دەبەستو تەزبێحێکی قەزوانی گوڵنگە زەردی بەردەدایەوە ••

که ئێوارانی لێ دەهات ئاوها خۆی دەگۆڕیو دەهاتە سەر سیلەی ئەو کۆڵانە تەنگەبەرەی کە وەك جۆگەلەیەکی باریك دەچێتەوە سـەر ڕووباری شاڕێکە •••

لەگەڵ دووان سیانێ لە هاوڕێکانی تا ئێوارەیەکی درەنگ سیلەی کۆڵانەکەیان دەگرت •• لە هەواڵو قسەی قوتی نوێ ئاگادار دەبوون • کە تاریك دادەهات خۆیان بەماڵدا دەکردەوەو سەریان بەسەر کتێبەکانیاندا دادەژەنـدەوە • کـارە ، بـە هیـوا بـوو نمـره بهێنـێو دەمـی لـە دوکتۆرییەوە دەدا •• کابرایش قینی لە سێ کەس زۆر دەبـۆوە •• ئەوانەی کلاش بە سەرێوە دەکـەن •• ئەوانـەی ڕیش دەهێڵنـەوە •• ئەوانەی سیلەی کۆڵانان دەگرن •

ئەو ئێوارەیەش باری شەقامەکە گۆڕا •• ئۆتۆمۆبیلەکان باریکیان کردەوەو پەنایان گرت • لایتی پێشەوەیان کز کردو گلۆپی ناوەوەیـان هەڵـکرد • کابراو دەسـتەکەی بـە خێرایـی دەهاتـن • خۆیـان بـە ئۆتۆمۆبێلەکانیاندا هەڵواسیبوو • لە ئاستی کۆڵانەکە زیرەی ئیستۆپێك ئەو ناوەی شلەژانـد ، وەك تیپی یاری پـێ بـە گۆڕەپانـی شەقامەکەدا بڵاوبوونەوەو چاوی ڕێبوارەکانیان ترساند •

پلەی گەرمی لە سیلەی کۆڵانەکە هەڵچوو •• کارە ڕەهێڵ بوو •• هـاتو چوونی ڕێبواریـش بۆ چەنـد هەناسەیـەك وەسـتاو پەنـگیان

خواردەوە •• پارچە ئاسنێکیان ئاخنی‌یە باخەڵی‌یەوە !• کە پەنگاوی ئەو خەڵکە بەری پایی بوو ، وەك پۆلە کۆتری لە واشە ترساو ، دەیانویست هەرچی زووترە پەناو پاسارێـك بدۆزنەوە خۆیانـی تـێ‌پەستن •• بـە بەرچاوی ئەوانەوە ئاسنەکەیان لە باخەڵی دەرهێنا !•

لەسەر پشت کەوتبوو •• کەوتنەکەی لە چوارمێخـەی عیسـای دەکرد •• خیزەخیزو لرخەلرخێکی سامناکی لێ بەرزدەبۆوە •• تەنهـا پێڵاوەکانی ڕێك لەگەڵ ترپەی دڵـیدا بەرەوڕوویان دەلەری‌یـەوە •• پاژنەی لە زەوی گیرکردبوو وەك نەیەوێ سەرزەوی بەجێ بهێڵێ •

ئەمسەرو ئەوسەریان لێ‌گرت‌و هەوایان دایە پاشی پیکابێك‌و لەسەر سینگی کەوتنە هەڵپەڕین‌و هات‌و هاوار •• گەڕەکەکەیان پڕ لـە هەراو زەنایەکی ناساز کرد •• کۆڵانەکەیش هەڵچوو •• کارە •• کاروان •• کاروانی حەمە عەلیی چایچی •••

★ ★ ★

هەموو برادەرەکانت ئەم ڕووداوە دەزانن • گوێت لـێیان بـووە وتوویانە : « کاوە گشت گیانی زامـە ، دڵـی ڕابـگرن • » •• ئـەوا هەناسەیەکی تاڵ هەڵدەکێشی • لەشت کرژ بووە • دەستت بە دوگمەی ڕادوێکەدا نـاو ئاوازێکی هێمنی لـێ بەرزدەبێتـەوە • هەڵسایتـەوە • دووربینەکەت بەرزکردەوە • پەنجە بە بەکرەکەیدا دەهێنی • وا لەسەر ڕووی هێستر سوارەکە نێت بووە •• شـێوەی دەکەی ، هەر ئەوەیـە دەنگتان ناگاتە یەك ، ئەگینا وەکوتر لە پاڵتایە •• لە گەڵ شێوەکردنیدا ، وردە وردە ئەو ڕووداوانەیش کە خۆیان تێوە ئالاندووە لە گەنجینـەی بیرەوەری‌یەکانتەوە بە ئاگادێنەوە ••

هەندێ هەناسەی ژیان هەیە چارەنووسی پێوە بەندەو نرخی سالّدارێکی هەیە • ئێوەش هەناسە لە سینەتاندا پەنگی خواردبۆوەو ورتەتان لە خۆتان بڕیبوو • هەر جووتە چاوە دووربینێك بوو • گوێ ئامادەی قۆزتنەوەی دەنگ بوو ، جا لە ئاسمانەوە بێ یاخود لە زەوی‌یەوە •• چاوەکانی تۆیش بە جادە قیرەکەوە قەتیس مابوون • لە بێدەنگیدا ، خەڵکی گوێ لە دەنگێکی نزمیش دەگرن • باسەڕە بالاّ دەنگ بوو • لافی بەهارانی لێدەداو بە هاژەوە لەسەردا دەهات •

چاوت تێوە بوو وەك گای تالاّنی ، لۆری‌یەك لە ڕێ لای‌داو گلا • ناڵەیەکی لێوە هات‌و لە شیوەکەی دەستە چەپدا خامۆش بوو •• دووکەڵێکی قیرین سەری شیوەکەی نایەوەو کەپرۆکەی بەسەرەوە کرد• هەوای دۆڵەکەی بێ ناساز بوو ••

گڕ ، زمانی شەیتان بوو دەچوو بە ئاسماندا •• هەراو شڵەژان •• بانگ‌کردن‌و تێڕاخوڕینی شپرزانە •• پەناگرتنی زەلام •• خۆ بەکێش‌کردنی پێکراو •• بەرزبوونەوەی فیزاح‌و تێکچوونی ڕیزی کاروانەکە • لاڕێ گرتنی ئۆتۆمۆبیلەکانی دوواوە •• باڵندە ترساوەکان ڕووەو دەربەندەکە دایان لە شەقەی باڵ‌و پەرەوازە بوون • وەك زەمان چەقی بەستبێ‌و زەوی تۆپە باغەیەکی بە جەڕو مەنگەکارکردوو بێت‌و خاو بوو بێتەوە •• کەچی وەکوتر ئەوەندەی نەخایاند کاروانەکەی بەرامبەرت پەلەپڕووزەی پێ‌کەوت • ئۆتۆمۆبیلەکان بە تیژی پێچیان‌دەکردەوەو قیرەکەیان دەڕووشاند • بڕێ جار سواری کۆڵی لاڕێ‌و وشکەسی‌یەکە دەبوون • دەنگێکی ناساز لە مەکینەو پێچکەکانیان هەڵدەسا •• ڕاکردنەکەیان لە جم‌وجووڵی کاریکاتێرانەی دەکرد ••

دوو یادگاریان لێ بەجێما • یەکەمیان لە دۆڵەکەی دەستەچەپـدا دووکەڵێکی تەنکی لێ هەڵدەسا •• بۆنی لاستیـك‌و بۆیـەو ئیسفەنجی سووتاو لووتیان تووشی پەسیو دەکرد •• ئەوی دیکەیان ماشینێکی گچکە بوو ڕووەو تۆ ڕەوڕەوەکانی چەپ‌و چیپ وەستابوون• لەگەڵ گاشەبەردێك شەڕە شۆقیان کردبوو • بەردەکە تەوێڵی تێك‌قوپاندبوو • لووتی چووبوو بە قووڵاو وێنەی بەرانی شاخ شکاو لەئاستی گاشەبەردەکەدا چووبوو•• ئەمە یەکەمین نیشانە بوو بەرامبەرت قوت‌بۆوە ، کاتێ لە پەنابەردێـکدا کە نزیکەی بستێك سەر زەوی‌یەکە کەوتبوو ، لەســەر سـك درێژ ببووی • ئەویش تا دەهات پتر بەری ڕوانینی دەگرتی • کردتە نیشانە • چاوت لێ‌بوو وردە کونی ڕەشی تێ‌دەبوو • لە شـــوێن کونەکانــەوە دووکەڵ دەهاتە دەرەوەو هەر لەسەر خێرایی خۆی بایدایـەوە لاڕێ‌و تووشی گاشەبەردەکە هات • ناڵەیەکی لێ بەرزبۆوەو لە دارو بـارەوە لە گرێژەنە چوو ! •• دەرگاکانی کرانەوە • شـوفێرەکەی بەسـەر ستێرنەکەوە لاربۆوە •• دیمەنی ماشینەکە لە دەست‌هەڵبڕینی کابرایەکی زارەترەك دەچوو •• تەنها زەلامێکی لێ هاتە دەرەوە • ئەویش بــە دەرگای سەکندا شۆڕبۆوە ، لەسەر وشکەسـی‌یەکە گرمۆڵـە بـوو ! نەیتوانی بستێك چی‌یە لەو دەوروناوە دووربکەوێتەوەو پەنابگرێ ، کە لە تەنووری داخراو دەچوو •• ئاوها ئەو چەند ساتە کورتەت بینی ••

کە گەیشتیتە سەری ، لە ماشینەکە دوورت‌خســتەوەو لەســەر پشت ، لەبان قیرەکــە درێـژت کرد • بەپـەلە چاوێـکت پێـدا گێـڕا • ( عەلی ) •• ( عەلی خەڵەف ) ••• هیچ نیشانەیەکی ئەوتـۆ بە قـوڵ‌و لاملو سەرشانی‌یەوە نەبوو •• مام سەردار بە سەرسامی‌یەوە پێی‌وتی :

— « نیازی چیت بەم کابرایە هەیە کاوە ؟•• ئەوەتا گیان دەدات ••• ئەمشەو لێ‌دەبێتەوە ! » •

ـــ « نیازم خراپ نی‌یه مامه ! » •

ـــ دوور نی‌یه بگه‌ڕێنه‌وه سه‌رمان • له‌وانه‌یه ئه‌مجاره‌یان له ئاسمانیشه‌وه له‌گه‌ڵمان بکه‌ن •• ده‌ست‌و برد کردن له‌م ده‌رفه‌ته‌دا چاکه •• »

عه‌لی ، ده‌یلرخاند •• له سه‌ر جله‌کانێوه ده‌ڵه ده‌ڵ له‌به‌ری ده‌ڕۆیی • چاوه‌کانیشی گێژ ، له‌وه‌دابوو ژێره‌وژوور بن •• سه‌رت هه‌ڵبڕی هێشتا مام سه‌ردار به‌ژوور سه‌رته‌وه بوو •• فه‌ره‌یدوون ، له‌دوایه‌وه چاوه‌ڕوان بوو •

ـــ « ئه‌وه گشتیان په‌ڕینه‌وه ئه‌وبه‌ری چه‌م ، هه‌ر ئێمه ماوین •• ده‌ترسێم له‌م که‌ین‌و به‌ینه‌دا تێدا بچی کاوه ؟! »

ـــ « لێی گه‌ڕێ مامه ، ئه‌وه کاوه‌یه ، چی ده‌کات بام بیکات !! »

فه‌ره‌یدوون بوو ئه‌مه‌ی‌دا به‌گوێی مام سه‌رداردا •

« گشت گیانی زامه » •• ئه‌م قسه‌یه‌ت وه‌ك برووسکه به یاددا هاته‌وه• وه‌ك زه‌نگێکی زه‌به‌للاح له‌وانه‌ی به کڵێسه‌کاندا شۆڕی ده‌که‌نه‌وه ، له کاسه‌ی سه‌رت‌دا ده‌زرنگایه‌وه •• زامه‌کانت هاتنه‌وه سوێ •• دیمه‌نی دوا ئێواره‌ی ته‌مه‌نی کاروانت هاته‌وه پێش چاو •• له‌سه‌ر پشت که‌وتنه‌که‌ی• لرخه‌لرخ‌و ته‌واو نووزه‌ی به‌ئاسته‌می•• هه‌راو زه‌نای کۆڵان• کونه‌کانی سینگ‌و گه‌ردن‌و ڕووی •• چوار مێخه‌ی عیسا بوو ، جارێکی‌دی به خاوی له به‌رچاوت لێ‌درایه‌وه ••

قاچەکانیت جووت کرد • هەردوو دەستت بۆ بن‌باڵی برد • پرت پێدا کردو دات بەسەر شانتدا •• پارچە گۆشتێکی شلەپەتە بوو ، توانای خۆڕاگرتنی نەمابوو •• خیزەو لرخە لرخێکی ساماناکی لێ بەرزدەبۆوە•• وەکو کۆمەڵە دەنگێکی تێکەڵو پێکەڵو ئاڵۆز لەبنی بیردا نووزەیان بێ‌و داوای کارێکی گرنگت لێ‌بکەن •• تۆیش لێیان حاڵی نەبی • وەهابوو ••

لەسەر شانی ڕاستت جێت بۆ کردەوە •• تینی گەرمی گەیشتە کۆڵنجت ، وردە وردە پێیدا شۆڕبۆوە •• شانتان نا بە شانی یەکدی‌یەوە •• بە دەستی ڕاستت ڕانەکانیت گرتبوو •• لووتی پێڵاوەکانی دەیدا لە کەشکەژنۆت • دەستی چەپشت لەنگەری کۆڵەکەی خۆت پێ گرتبوو •• قەدەرێك بە کەناری باسەڕەدا سەرەوژوور بوویتەوە • ئەژنۆت شل‌و هەناسەت سوار بوو •• ئەمجا لەسەر تەختایی‌یەك درێژت کرد •• ڕووی بەهێ‌یەکی گەیوو بوو • لێوی وەك خاڵە کوتراوەکەی سەر لووتی شین هەڵگەڕابوو •• توێژاڵێکی سپیی ڕێ‌ڕێ بەسەریەوە قەتماغەی بەستبوو •• دەنگێکی بێ واتای لێ بەرزدەبۆوە •• مام سەردارو فەرەیدوون لەوبەری چەمەوە داردەستەکانیان هەڵبڕی‌و هێمایان بۆ کردی •• دەستەکانت لە ئاوەکەدا شت‌و بە مستی پڕەوە کەڕایتەوە سەری • کردت بە زاریدا •• زمانێکی بە لێویدا گێڕاو چاوە لێڵ‌و گێژەکانی تا ماوەیەك لەسەر ڕووت نەترووکاندو نەیگواستەوە •• کەمێ تووکی ڕوون بۆوە ، وەك بڵێ « زۆرم تینوو بوو ، کارت ڕاست بێ • » • ئەوەندە هەبوو تێ‌ڕامانەکەی تێکەڵ‌بوو لەگومان‌و دڵنیایی ، وەك بڵێ : « ئەرێ کابرا نیازی چیت پێمە • خۆ من لەحەوت ساڵان ڕاست بوومەتەوە ؟! »

چەقۆکەت لە پشتوێنەکەت جیا کردەوە •• دەستێکت خستە ژێر شانی‌و هەڵتبڕی • وەك مریشکی نەخۆش سەری لێ ببوو بە تەوق ، پێی ڕاگیر نەدەکرا •• دوگمەی کراسە بەڵەکەکەیت یەکە یەکە ترازاندو پاڵتدا بە تاوێرێکەوە •• لووتی چەقۆکەت دا بە تاوێرەکەداو دەمەکەی کرایەوە ••

* * *

ڕووت کردەوە دەربەندەکە • قاتر سوارەکە هاتە بەر بینایی دووربینەکەت‌و کادیرەکەی پڕکردەوە •• بە پەلە دێتەڕێوە • توند خۆی بە کورتانی قاترەکەوە •• نووساندووە •• کابرای چاوساغیش خێرا خێرا ئاوڕی لێ دەداتەوە • چاوت لێیە ، وەکو گەردو تۆز بێت‌و لە شوێن سمی وڵاخەکەو شوێن پێی کابرای پیادە بەرزبێتەوە وەهایە •• بایەکە گێژی دەداو چوارپەلی وڵاخەکە لەوە دەچێ بەناو تەمێکی تەنکدا ڕێ‌بکات •• ئەوا دەستت بۆ بەکرەی دووربینەکە بردو سووڕاندت تاکو لەسەر ڕووی سوارەکە تەواو نێت بوو •• ئێستا گومانت لە لا نەماوە کە ـ عەلی خەڵەف ـ خۆیەتی •• کابرای پیادەیش چاو ساغێتی‌و ڕەنگە هێسترەکەیشی لێ بەکرێ گرتبێ تاکو بگاتە جادەی قیرو لەوێوە بۆ شوێن‌و مەنزڵی خۆی •• دیمەنێکی بێ‌دەنگ‌و بە جووڵەیە •

* * *

دەمی چەقۆکەت تێ‌ناو تا ناوشان کراسەکەیت هەڵتڵیشاند ••

ئەمجا لە لاسکی فانیلەکەت ناو هەڵت‌هێنایەوە •• پاڵت دایەوە بە تاوێرەکەوە •• هێشتا هەر لەبەری دەڕۆیی •• جامانەکەت لە سەرت داماڵی •• لەسەر زەوی‌یەکە پان‌و شەفتوولت کردەوەو سێ گۆشەیەکی درێژی لێ‌دەرچوو •• لە بن‌باڵی‌یەوە بردت بۆ سەر شانی‌و توند

گرێتدا •• لە ڕەنگو ڕوخساری تێکشکاویدا تـەنیابالی و بێ کەسـی دیاربوو •• ملی بەلارەوە نابوو •• بە هێلە چالەکانی ناوچاوانیدا دلڕەق دەهاتە پێش چاو •• هەولی دەدا خۆی قیت بکاتەوە •• سەرنجەکانـی ڕاوەستاوترو گونجاوتر بکات •• ڕووی تێکردیت •• وەکو هەرگیز چاوەڕوانیی ئەوەی نەکردبێ وابە کەفتەکاری بکەوێتە دەستی کابرایەکی نەناسو بگرە ناحەزیش •• ئاخێکی هەلکێشاو دەستی بە نالەو خیزەخیز کردەوە ، نەیتوانی هیچ بلێ •• تۆ ئەو جۆرە دەنگەت لەوانە بیستبوو کە دەبوورانەوە ، یاخود پەرکەمیان لەگەل بوو •• لەوانەشە هاواری کەسێکی ئازیزی کردبێ ••

★ ★ ★

سەرنجت لەسەر عەلی خەلـەف گواستـەوە • دووربینەکەت بـە بەرۆکتدا شۆڕکردۆتەوە •• ( ئاسۆ ) لەسەر تاوێرێك جلی ژێرەوەی دەشوات • لەپال خۆیەوە کراسەکەی بەسەر بنە تەرووبەکدا داوە ، وەك قارچك هەلتۆقیوە •• چەنـد ڕۆح سـووکە ؟!•• ئـەگەر لـە شیرین خەویشدا ڕایپەڕێنی بەدەمتەوە پێدەکەنێ •• هەمیشە نوکتەی بەسەر زارەوەیـە ••

ئەوا ( حەمە سالح ) تێی هەلکردە قەتار •• خۆیشت نازانی بۆ کە حەمە سالح گۆرانی دەلێ ، ئیتر بە تۆ بێ نەهێلی با سروەی بێو مەل بجریوێنێ ؟• بە تۆ بێ هەموو گیانت ببێ بە گوێو بۆ گۆرانییەکانـی ئەوی شل بکەیت •• دوور نییـە سروشـتە جـوانەکەو ئـەو کاتو سەردەمەی تێیدا دەلێ ، ئاوازە میللییەکانی ئەوی لە لا خۆشەویست کردبێ •• ئـەوا هەواکەی گۆڕیو بوو بە بەستەیـەکی بەئاهەنگو خێرا •• لەگەل خێراییەکەدا لەڕینەوەیەکی کـوردانەی تێـدایە ••

هەرچەندە ڕستەیەکی کورتی مۆسیقایە دووبارە دەبێتەوە بەڵام نابێزرێ، شان دەهێنێتە بزاوتن‌و ئارەزووی هەڵپەڕین دەجووڵێنێ •• ئەوە دووان لە هاوڕێکانت داردەستەکانیان هەڵپەساردو لەسەر تەختە تاوێرێك دەستیان بە شان جووڵاندن کرد • حەز دەکەی لەگەڵیاندا دەست بگری • بە دەنگی حەمەساڵح دەروونت دێتە جۆش‌و خرۆشێکی بێ‌ئەندازە •• لەوەدایە قاچەکانت لەسەر زەوی بەرزبنەوەو بفڕی •• لەم دەمەدا بیر لە هیچ ناکەیتەوە • تەنانەت زامەکانیشت بیرچوونەتەوە •• وەکو کاتی لەدایك‌بوون وەهایە •• دەروونتی بێ لە بۆدڕن‌و خەوش دادەشۆررێ•• سپی دەبێتەوە وەك شیری بەری دایکت ••

دەستت بۆ دووربینەکەت بردەوە• هەردەو باسکەکانی خۆێلێنەکەت کێش کردە بەردەمت‌و دەشتی کرکای کرکت هێنایەوە یەك •• لبادێکی کوردی‌یەو لە بەرپێتدا ڕاخراوە •• باسەڕەی بە هات‌و فەرپیش سەری لە بەرپێی خاکی تەژنەی ڕەشباوی گەرمیاندایە •• دەڕوات‌و سەوزایی لەدوا بەجێ‌دەمێنێ •• چاو بە کەڵۆزو ملەو هەورازەکاندا دەگێڕی • بەری لای چەم هەڵدێرە •• کەندو شینکەو تاوێرە •• دەم ڕێگایش حوشترخوار ••تا زاری دەربەندەکەیش ئەم گیا قژقژاوی‌یە ئەو ناوەی تەنیوە • کەچی لەوێ بەولاوە تەڵێك چی‌یە بەدی ناکرێ ••

ئەوا ڕووت کردەوە دەربەندەکە •• هێستر سوارەکەت تەواو لێوە نزیکە ، چاوی دووربینەکەی داگیرکردووە •• هەناسەیەکی قووڵی دڵنیاییت هەڵکێشا •• دڕی بە ڕێزنە ئاسنە دەنووك تیژەکانی سەر سینگتدا •• خۆشی‌یەك هرووژمی کردە سی‌یەکانتەوە •• خۆشیی کڕینەوەی ژیانی مرۆڤێك •• مرۆڤێکی ساویلکە •• بە دەنگێکی ئاشکرا وتت : « دیارە دوکتۆر سیروان ڕەنجی چاکی لەگەڵ داوی • ئەگینا

ئەو زامانە وا زوو سارێژ نابن •• »

ئێستا ڕووی عەلی خەڵەف ، پڕ بە کادیـری دووربینەکەتـە • شەماڵ تاڵە مووەکانی سەری دەهێنێ‌و دەبا •• لچکی جامەدانی‌یەکەی کابرای چاوساغیش بۆ دواوە دەفڕێنێ‌و دەیداتـەوە بەسەر شانیـدا •• ولاخەکە لەسەر ڕەوتی خۆی ، بەپەلە ، وەك ئەسپی وێرغە لەسـەر ئیقاعێك ڕێگاکە دەپێچێتەوە •• لـەو هـەورازە سـەر هەڵێنێ ئیتر لـە بەردەمتدا قووت‌دەبێتەوە •• دووربینەکەت بە بەرۆکتدا شۆڕکردەوەو بیریشت گەڕایەوە بۆ دە ڕۆژێك لەمەوبەر •

★ ★ ★

بەوەی باش‌بوو کورتانەکەی عەجەمی بوو •• باوەشت پێداکردو لەسەر دەم دات بە ناوکۆڵی کورتانەکەدا •• هێسترەکە پرمەیەکی لێوە هات‌و سڵەمی‌یەوە • وەك بڵێت : تاکو ئێستا لەم جۆرە مرۆڤانە سـواری پشتم نەبووە !••

قاچەکانی بەلای باسەڕەداو ، سەریشی لە نێوان هەردوو باڵیدا بە دیوی وشکاییدا شۆڕبۆوە •• کە دڵنیا بووی لەوەی تەرازوو داتنـاوە هێسترەکەت دەنگ‌دا •• بە سەراوردی ئەم دیمەنەوە دەربەندەکە لـە - ڤی - دەچوو •• ڤی‌یەکی هێجگار گەورە !•• جڵەوی هێسترەکەت گرت •• عەلی ، جگە لە چەند دەنگێکی ئاڵۆزو تێکەڵ ، کە لە وڕێنەو تاووتێی گرانەتاگرتوو دەچوو ، هیچی لێ حاڵی نەبووی • ئـەوەندە هەبوو کفت‌و ناڕەحەت بوو • تەواو لە هاوڕێکانی خۆتی دەکرد کاتێ کە دەپێکران •• بە زمانەکەی خۆی ئەمەت بەگوێدا چرپاند : « گوێ مەدەرێ برادەر ، لەگەڵ دوکتۆردا ڕۆحمان بەسەر یەکەوە دەردەچێ • هەر بتگەیێنمە دێلێژە ئیتر لەخەم ڕەخسیوی ! • »

وادیار بوو له هۆش خۆی چووبوو • جگه له بڵمەبڵمو خیزەی سینگی هیچی دیکەت لێ هەڵنەکڕاند •• ڕووت کردە زاری دەربەندەکە خۆر بۆ باوەشی چۆمو چۆمەڵانی زەنگنە شۆڕدەبۆوە •• تیشکەکەی دەیدا لە ناوشانو تیلاکت • سێبەرەکەت لە پێشتەوە بەسەر باسکەکاندا دەکشاو دەتەنییەوە • وردە وردە کەڵەگەت دەبوو • ئەمجا بە چیاکەدا هەڵدەزنا •• لەو دەمەدا خۆت بە پاسەوانێکی بەشکۆ دەزانی • پێت وابوو ، ناوچەکە ، بە مرۆڤو دەشتو بەندەنەوە تۆ دەیانپارێزی • بەتایبەت کاتێ سێبەرەکەت دەبینی بە چیاکەدا هەڵدەگژاو سەرت وەختەبوو بگاتە لووتکە •• ئەو خولیایەی کاسەی سەرتی تەنیبوو ، هێندەی دی لەلات شیرینتر دەبوو •• ( ڤی ) یە گەورەکەی دەربەندی باسەرە ، باوەشی بۆ کردیتەوە • لەقتەیەکی پانۆرامایی بەنرخە ، لە دەفتەری یادگاردا سڕینەوەی نابێ ••

★ ★ ★

ئێستا بەشی زۆری برادەرەکانت خۆیان پۆشتەکردۆتەوە •• چاوت لێیە ـ ڕێبوار ـ شانی داداوەو دەخوێنێتەوە •• سەرنجی دەربەندەکە دەدەیت • ئەوا چاوت بە بالای چیاکەدا سەرخست • ئەم دیاردەیەت بۆ لێك نادرێتەوە • هەرچی دیوی زەردیاوایە جەنگەڵستانە • دایکێکی دڵسۆزە باوەشی بۆ ساواکانی والا کردووە •• کەچی بە دیوی گەرمیاندا ڕووتەنو سووتمان ؟!••

بەرامبەرت ، تیتر واسکێك باڵە بازووەکانی پێکدا دەدات • سرکەو نزیکە زەوی دەفڕێ • دەزیقێنێو تیژ بادەداتەوە •• تاکو ئێستا نەتدیوە بە بالای منارەیەك بەرز بێتەوە • لەوەدەچێ بەرزەفڕ نەبێو لە بەرزایی بسڵەمێتەوەو زیقە زیقەکەیشی هەر لەئەنجامی ترسەوە بێ •• کلاوکوڕە

ساویلکەکان بە جووکەجووکی ناسکیانەوە دێن‌و دەچن • زوو زوویش سینگ بە زەوی‌یەوە دەنێن‌و خۆیان مت‌دەکەن •

دانەویتەوەو سەیری بەربێی خۆت دەکەی • چەپکێ ـ کلدان ـ بێ لەدەرگادان خۆیان بە دەروازەی چاوەکانت‌دا کرد •• لە شوێن کۆنە پاسگە چی ڕوواوە ؟!•• ئەم دێهات نشینانەیش چەند جوان ناوی گوڵ‌و گیای دەشتی دەنێن ؟•• تەنها دوو گەڵای مۆر •• یەکێکیان پەل‌و ئەوی دی‌یان درێژکۆلە لە شێوەی کلچۆکدا •• ئەگەر گوڵناسەکان بەم گەڵایە ئاشنا بوونایە ، لەمێژ بوو لێ‌یان گواستبۆوەو ، ئینجانەکانی شاریان پێ ڕازاندبۆوە •• وا جارێکی دیکە خەیاڵت بۆ لای دە ڕۆژ بەر لە ئێستای عەلی خەڵەف هەڵدەفڕێ ••

★ ★ ★

دەربەندەکەت بڕی‌و بەلای ڕاست‌دا وەرچەرخایت •• قاترەکە لووتی‌نا بە چیاوە •• دێلێژە هەڵۆیەو لە سای سەگرمەدا هەڵنیشتووە •• کەوتیتە شوێن هێسترەکە •• دەنگی ناڵەکانیت جارێکی‌دی لە ئەشکەوت‌و ئەستەمەکانەوە دەبیستەوە •• ڕێگاکە ڕەشمارێکە ، کلکی لە چەمەو سەری لە ناودێ •• دوو پێچ سەرکەوتیت‌و بە دەنگتەوە هاتن •

ــ « وام زانی هی خۆمانە ! »

ــ « خۆمان زیانمان نەبوو • »

ــ « مزگێنی‌یەکی خۆشە ! »

دوکتۆر ، بە سەر هێسترەکەوە چاوێکی پێدا خشاندو هیچی وەهای نەدرکاند •

ــ « کاوە ، دەبوایە تۆ دوکتۆر بوویتایە ! »

ــ « لەبەر چی دوکتۆر ؟ »

ـــ « گیانی فریاکەوتنت تێدایە •• ئەی هاوڕێکانت کوان ؟ »

ـــ « پەڕینەوە بەری تیلەکۆ • »

ـــ « خۆت خستۆتە مەترسی‌یەوە !•• تاقو تەنیا بە شوێن ئەم کابرایەوە •• پێم نالێی چۆن چوویتە ژێر ئەم بارە گرانە ؟!»

ـــ « پێشتر هی خۆمانم بەو ڕەزەڵخوایی‌یە دیبوو • ئەمیشم وەك ئەوان هاتە پێش چاو•• ئەوان ئاسا دەینالاندو هاواری دەکرد!• ئەمیش زوو زوو لێوی وشك دەبێ •• ئەمیش زمانی شکابوو ، بە چاو داوای یارمەتیی لێ دەکردم •• خۆشت دەزانی بۆ دواڕۆژ ئەمانە دەبنەوە پشتو پەنای خۆمان !•• »

ـــ « ئەی ئەگەر هی ئێمە بوایەو بکەوتایەتە لای ئەوان ؟! »

* * *

خۆشی‌یەکی لەڕادەبەدەر دەمارەکانت ڕادەژەنێ • وەهای بۆدەچیت کارێکت کردووە لەدەست هەموو کەسێك نایەت ••

هاوڕێکانت لە دەوری « ئاسۆ » ی قسە خۆش دەکەون بە پشتاو دەتریقێنەوە •• « نەوزاد » نەبێ ، لە سروشتی مراویدایە • لەش‌و لارێکی درێژو تووکن •• گەنم ڕەنگ •• زوو زوو خۆی نوقم دەکات ••• ڕەنگە ماسی‌یەکان بە مارماسی‌یەکی زیانیدەی تێبگەن‌و لێی بڕەوێنەوە •• مام سەردار ، داردەستەکەی لەسەر ڕانی درێژ کردووە • وەك بەلایەوە ناخۆش بێ بە بست لێی دوور بکەوێتەوە •• ڕەنگ‌و ڕووی لە هی ئەو مامۆستا ئاغرو سەنگینانە دەچێ کە هێمن‌و لەسەرخۆ چیرۆکی پڕ لە پەندو بەسەرهات بۆ شاگردەکانیان دەگێڕنەوە •••

دەستت دایەوە دووربینەکەت • ڕووی عەلی خەڵەف هاتە ناو کادیرەوە •• ڕوخساری تەواو گۆڕاوە •• پێستی سپی هەڵگەڕاوە • دڵڕەقی‌یەکەی ئەوسا بە هەنیەیەوە نابینرێ • تەواو ڕوویت لێوە نزیکە•• دیمەنەکە جارێکی دیکەیش سواری باڵی خەیاڵی کردیتو گەڕایەوە دواوە •••

★ ★ ★

— « حەز دەکەم سەرێك لە نەخۆشەکەمان بدەین •• »

ڕاپەڕیتو دوای دوکتۆر کەوتیت • سەربانەکانی لای خواروو ببوونە حەوشە بۆ ماڵەکانی سەراورد •• لێکسەکە بە شەوقو دەنگی‌یەوە خەڵکی بۆ لای خۆی کێش دەکرد ••• بەرهەیوانێکی لاکێشەیی ڕووەو ڕۆژهەڵات • بە چەند پاپیلکەیەك بۆی سەرکەوتن •• دۆشەکێکی ئیسفەنج لەسەر لبادێك ڕاخرابوو •• عەلی لەسەری ڕاکشاوە • جاجمێك تا سەر سینگی هاتووە ••

— « ئەمە کاوەیە •• بەڵام لەجێی خۆت نەجووڵێی ؟ ! » •

دوکتۆر بوو وەهای پێ گوت • پڕ بە پێڵوو چاوەکانی کردەوەو سەری بەلای تۆدا لارکردەوە •• زەردەخەنەیەك کەوتە سەر لێوەکانی‌و زوو ڕەوی‌یەوە ، بوو بە وەڵامێکی هێمن •

— « نازانم چۆنتان چاکە بدەمەوە ؟ ! »

★ ★ ★

دووربینەکەت بە بەرۆکتدا شۆڕکردۆتەوە •• سەرنجی گۆمەکەو دەورو بەری دەدەی •• باڵندەیەکی وردیلەی قاچو دەنووك درێژ لە کەنار چینە دەکات •• حەمەساڵح بۆ لای تۆ سەردەکەوێ •• عەلی

،دایه بگاته بەردەم گردەکە • بە هەردوو دەستی پێشی کورتانەکەی
ووە • سووڕایت ، سەرەو خوار تا ئاسۆی دەمکەل ورد دەبێتەوە ••
ی‌وا بەدی ناکەی جێی گومان بێ • دەشتە ڕاکشاوەکە وەك گۆمێکی
ك لەنێوان سەگرمەو هەردەکانی خوێڵێنەکەدا قەتیس ماوە •• چیاکان
.چەندە سەخت‌و سەربەتەم بن ، دەشتەکانیش هەرچەنـدە بەرین‌و
شاو بن ، هەر دەبێ لە بناردا پێك بگەن ••

لە کەلاوەکە هاتیتە دەرێ • ڕووی بۆ لات وەرچەرخاند • بەدیی
.یت • ویستی دابەزێ ، بانگت کردە چاوساغەکەی :

نەهێڵی دابەزێ ، ناساغە !

بەڵام ئەو خەریکە خۆی بە ملی هێسترەکەدا شـۆڕ بکاتەوە •••
،و ڕووت دێ ، تۆیش دابەزیت‌و لە بناری گردەکەدا پێك گەیشتن••
شتان بەیەکدا کرد •

دوکتۆر زۆر شتی پێ‌گوتم •• گشت گیانت زامەو کەچی بە تەنگ
زامی منەوە بووی ! •• ئەگەر تۆ بوویتایەو دەست ئێمە بکەوتیتایە
دەزانی چارەنووست چۆن دەبوو ؟ !

چاك دەزانم •• بەڵام ئێمە ، تۆو برادەرەکانت بە ناحەز نازانین ••
دۆستی دواڕۆژمانن •

مرۆڤێکی گەورەی ! • ئـەم دە ڕۆژە بارتـەقای دە ساڵ لێتانــەوە
فێربووم •• یەکدی دەبینینەوە •• کە چوومەوە بە دایکم دەڵێم :
ئیتر تاقانــە نیم • برایــەکم لە چیایــە ناوی کاوەیــە •• چیشـــم
دیوە بۆیانی‌دەگێڕمەوە •• لە سەروو هەموویانەوە باسی جوامێریی
تـۆ •••

— به ئەرکی سەرشانم زانیوە •

— سەرم سوورِما کە دوکتۆر پێی وتم هاوڕێکانت بۆ ساڵی ئایند دەبنە ئەندازیار !

— جا بۆ سەرت سوورِ ما ؟

— ئاخر شارەکانت دەڕازاندەوە •• شەقامت ڕادەکێشا •• کۆشك •

— لێرەیش نەخشەی کۆشکێکی هێجگار گەورە دەکێشم ، گەور بەقەدەر ئەم سەرحەدە ، بۆ دوارۆژ •• لێرەیش هەر ئەندازیارم•

— ئەم قسەیەشت بۆ برادەرەکانم دەگێرِمەوە !

ئەو کەوتە سەر قیرەکە •• وا لە چاو وندەبێ •• تۆیش ڕووت قووت لەسەر تاشەبەردێك ڕاوەستاوی • نیازت وایە وەك سوور ماسی‌یەك تاسەی دڵت لە گۆمەکەی بەردەمتدا بشکێنی ••

**تشرینی دووەم ـ ١٩٨٢**

---

ئینسان میقیاسی هەموو شتێکە

**برۆتاگۆرس**

٤٨٥ ـ ٤١٥ ی پ• ز•

---

# بەرگوێکی دیوانی خادیم

محەمەد عەلی قەرەداغی

لەم رۆژانەدا بەرگی یەکەمی دیوانی خادیم بە بەرگێکی قەشەنگ‌و
اغەزێکی جوان‌و قەوارەیەکی ئێرەتیەوە کەوتە کتێبخانەکان (*) •

وەك تینووی هەر بەرهەمێکی کەلەپوورو هەر دیوانێکی شاعیرانی
لاسیکیمان دەستم کرد بە خوێندنەوەی ئەم دیوانەو بە وردی شانم لێ
ل کرد • زۆرم لێ نەخوێندبوەوە کە گەلێ سەرنجم دەربارەی
بوانەکەو کارو ئەرك‌و ماندوبوونی کاك جەمال لە کارەکەدا بۆ پەیدا
، بۆیە دەستم دایە قەڵەم‌و وردە وردە سەرنجەکانم لەسەر لاپەڕەکانی
یوانەکە دەنووسی ، ئەنجام سەرنجەکان زۆر بوون‌و گەلێ لق‌و پۆپیان
ێ بوەوە ، بە رەنگێك ئەگەر هەموو سەرنجەکان بنووسم دەبێ کتێبێکی
سەر بنووسم ، دیارە کارێکی وایش دەرفەت‌و دەرەتانی دەوێ ، بۆیە

---

(★) ئەم وتارە پاش دەرچوونی بەرگی یەکەمی دیوانی خادیم
نووسراوە ، بەلام لە وەختی خۆیدا مەیدانی بلاوکردنەوەی نەدرا •
ئیستاش کە لێرەدا بلاوی ئەکەمەوە وابزانم نرخی خۆی
ون نەکردووە •

جارێ « بەرکوڵێك » لەم دیوانە دەکەمو ئەگەر ماوەم بوو جاری دیکەیش
دەگەڕێمەوە سەری •

**وتەیەکی دۆستانە :**

کە بەرهەمێ یان دیوانو کتێبێکی پووچەڵو نابەکامو هەڵپڕووک
لە دەزگایەکی رۆشنبیری سەر بە میریەوە دەردەچێ دوو سێ پرسیـ
قورتمی خوێنــەر دەگرنو ناچار دەیانتەقێنێو دەڵێ : ئایا ئــەم بەرهە
نەدراوە بە پسپۆڕ ـ خەبیر ـ ؟ ئایا ئەگەر دراوەبە پسپۆڕ ئەو پســپۆڕ
نەشارەزا بوە ! ئەگەرشارەزای بابەتەکە بوە چۆن ئەم هەڵەو ناتەواویانە
بەسەردا تێپەڕیوە ؟ یان چۆن دانی بەوەدا ناوە بەرهەمی ئاوا لە ژێر باڵ
ئەوەوەو بە ( ئێ ) و ( باشــە ) ی ئەو ڕێــگەی چاپخانــەو کتێبخانـ
بگرێتەبەر ؟ •

دیارە ئەم پرسیارانە رەوانو جێگەی خۆیانە بکرێن ، بۆیە لێرە
وەك بیرخستنەوەیەك دەڵێم : هەر دەسگایەکی رۆشنبیری کە پرۆژەیەک
بەردەست دەبێ بێ ئەوەی سەرنجی ئەوە بدات بەرهــەمی کێیــە چـا
بکێرێتو پسپۆڕێکی شارەزای لێهاتووی بۆ بدۆزێتەوەو لە نهێنیەکی زۆ
تەواودا پرۆژەکەی بۆ بنێرێو دوایش گوێڕایەڵ بێ بۆ هەموو را
ئامۆژگاریەکانی •

دوای ئەمەیش دەبێ ئەو پسپۆڕە ســەرنجی کارەکە بداو ئەگــە
زانی لە توانایدا نیەو هێزی بە هەڵسەنگاندنی ناشکێ ئەوا هەر لە ڕێــو
بە ئەمانەتەوە کارەکە بداتە دواوەو بڵێ : لە توانای مندا نیە • وە ئەگە
زانی بابــەتی خۆیەتیو باشــی لە قــەرەی دێت ، هەڵسێ زۆر بە وردی
بێلایەنی بیخوێنێتەوەو ، زۆر قووڵ بچێتە ناو باسەکەوەو پێش هەمــو

شتێك ئەوەی لە بەرچاو بێت کە ئەگەر ناتەواوی‌یەك لەو کارەدا بێت ئوبالّی بە ئەستۆی ئەوە • جا دوای ئەمە ئەگەر کارەکە پەسەند بو ( باشە )ی بۆ بڵێت • وە ئەگەر شیاوی چاپو بڵاوکردنەوە نەبو ئیتر لا لەوە نەکاتەوە بەرهەمی کێیەو نیە حوکمی راستو روون و رەوای خۆی دەربکات •

لێرەدا ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە گەلێ جار باش ئەوەی کتێبێك دەچێتە لای پسپۆڕێك زۆری پێ ناچێ نووسەری کتێبەکە دەزانێ کتێب لای کێیەو دەیان رێگەو هەوڵ دەکەونە کارو پسپۆڕ بێلایەنی دەدۆڕێنیو لەم ناوەیشدا رۆشنبیری دەبێتە قوربانی •

بە داخەوە ( لە دیوانی خادیم ) (١) یشدا ئەو پرسیارانە مل قوت دەکەنەوەو بە رەوایی دێنە پێشمەوە • لەم وتارەدا چەند خاڵێك پێش‌چاو دەخەم کە شیاوی باسن‌و بوونیان لە دیوانێکی وادا ـ کە بێگومان کاتو دەرامەتێکی زۆری لێ خەرج کراوە ـ جێگەی داخە :

- جاری هەر لە نووکەوە کاك جەمال هیچ رێبازێـکی دیاری نیـەو ئەوەی بۆ لێکۆڵینەوە دەکرێو پێویسـتە ئەو نەیکـردوە • یەکێـك لـە مەرجەکانی لێکۆڵینەوە ئەوەیە کە بە وردی باسی دەسخەتەکانی کتێبەکە بکرێو جیاوازیو باشو خراپیان دیاری بکرێو دوایی کامیان باشـــ بوو دیاری بکرێو ئەوی تریان پشت گوێ بخرێ ، کاك جەمال ئەڵێ : دیوانی خادیم دوو نوسخەی ئەسڵی هەیە ، بەڵام ئیتر باسی ئەوە ناکا کامیان باشترەو ، کەی نووسراونەتەوەو ، ئەو کامیـانی کردوە بە بنچینـــەی کارەکەیی‌و ، بۆچی ، هەروەها لە پەراوێزیشـــەوە هیـــچ جیاوازیـــەکی دیاری نەکردوە !
- ئەم بێ رێبازیو گوێنەدان بە ئەمانەتی علمیە بۆتە هۆی گەلێ ئاڵۆزی لە دیوانەکەدا : لەوانە کە کاك جەمال هاتو لە کۆتاییـدا

فەرهەنگی بۆ دیوانەکە نووسی ئیتر پێویست نەبو بێت لە پەراوێزی شیعرەکانیشەوە مانای وشەکان لێك بداتەوە ، دوای ئەمەیش دەبو لە فەرهەنگەکەدا یان بە گوێرەی پیتی هیجا یان غەزەل بەغەزەل مانای لێك بدایەتەوە • کەچی ئەو هەر جارێ بە جۆرێك خەریك بوە • زیاد لەوە دیوانێکی ( ٣٥٠ ) لاپەڕەیی کە پڕ بێ لـــە زاراوەی کلاسیکیو وشەی عەرەبیو فارسی چۆن دەبێ بە (٢٠) لاپەڕە فەرهەنگ لێی دەسبەردار ببێ لەگەڵ ئەوەیشدا زۆری دوو پاتو بێ واتەیەو زۆریکی تریشی لەوانەیە کە پێویستیان بە مانـا لێکدانەوە نیە ؟!

- هەروەها جێگەی سەرنجو باسە کە کاك جەمال لە دیوانێکی وادا پشت بە هیچ سەرچاوەیەك نەبەستێو ، لە خۆیـەوە ( تەقـلەی ئیمام محەمەیی ) قسە بکات و مانا لێبداتەوەو تەنها بـۆ ئاهـی سوێند لە دوایدا دەڵێ : بۆ نووسینی فەرهەنگەکەی سوودی لـە فەرهەنگی دیوانی نالی د• مارف خەزنەدار وەرگرتوە •

- وەك پێویستو باوە بە گوێرەی پیتی هیجا شـیعرەکانی دانـەناوە ؛ چونکی ئەوەی لەم جۆرە دیوانانەدا پەیڕەوی دەکرێ ئەوەیە لە لە ( ئەلف )ەوە تا ( یێ ) دەست پێدەکرێو کە دەستکرا بـە ئەلف دەبێ لە تەواوی پارچەکانی ئەلفیشدا پەیڕەوی پیتەکانـی هیجا بکا واتە کە ( ئودەبا ) و ( نوقەبا ) لە کۆتایـی شیعرەکانـی قەسیدەیەکدا هەبوو دەبێ ئەو قەسیدە لە سەرەتای تیپی ئەلفدا بێو نابێ ( هودا ) یان ( حوکەما ) یان ( ریا )ی لێ پێش بخرێت ، بەڵام کاك جەمال یان ئەمەی بۆ نەکراوە ، یان گوێی پێ نەداوە ؛ لە لایەکەوە لە ل : (٤١)ەوە تا (٨٣) چەند پارچە شیعری بێ

هیچ پەیڕەویەك داناوە ، دوای ئەوە هاتوە بە گوێرەی پیتی هیجا دەستی پێ کردوە کە ئەویشی ئاڵۆزاندوە ، هەر بۆ نموونە دەبوو پارچەی (١٨)ی ( ئەلف ) یەکەم پارچەی ئەو تیپە بوایە ، خۆ ئەگەر کاك جەمال پەیڕەوی دەسخەتی شاعیر خۆیشی کردبێ دەبو باسی بکردایەو دوایی پەنجەی بۆ ئەو ناتەواویانە رابکێشایە ـ ئەگەر چاکی نەکردایەن •

● لە ناو شیعرەکاندا بە دەگمەن چاومان بە وێرگولو نوختەو ئەداتی پرسیارو سەرسوڕمان ••• تاد دەکەوێ ، ئەمەیش ـ جگە لەوەی کە سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ ـ گومانی ئەوەیش دەخاتە دڵەوە کە کاك جەمال خۆیشی نەیزانیوە شیعرەکان بخوێنێتەوە دەنا بۆ ئەبێ ئەوەیشی پێ نەکرابێ ؟

● جگە لەمانەو لەوانەی دیکە مەسئەلەیەکی گەلێ گرنگ هەیە کە بەسەر کاك جەماڵو پسپۆڕیشدا تێپەڕیوەو باسی لێ نەکراوە • مەسەلەکەیش ئەمەیە : دوای خوێندنەوەی دیوانەکە دەردەکەوێ کە ( خادیم ) شاعیری چڵەپۆپەی مەیدانی ئەدەبی کوردی نیەو ئەو شاعیرە نیە کە هەرچی گوتبێ شیاوی دیوانی شیعرو چاپو بڵاوکردنەوە بێ ، بەڵکو چاکتر وابو گوڵبژێرێکی شیعرەکانی بکرایەو ، ئەوانەیش کەلاوازن جیابکرانایەوەو وەستایانە لەسەریان بنووسرایەو لە دیوانەکە دەربکرایەن ؟ چونکە زۆر شتی وا لە دیوانەکەدا هەیە شیاوی بڵاوکردنەوە نیەو بە زیاد جێگەو کاتو دەرامەتی لێ خەرج کراوەو ، رەوا نیە شتی وا لە دیواندا بێت • هەر بۆ نموونە ئەم پارچە شیعرە بخوێنەرەوە :

که هێندۆ یه له دەوری شاری ڕوما

له تاوا ئەشکی حەسرەت دێ بە ڕووما

له دووری تۆ چی‌یە ئاوی حەیاتم ؟

له زارمدا ئەدا تامی زەقووما

له بەحری بادە گەر غەرقم نەکەی تۆ

بە ساغیر نابێ قەتعی ئارەزووما

بە مەعلوومی ئەگاتە عەینی مەعلووم

ئەگەر عاشیق بکا تەرکی علووما

ڕەقیبی بێ حەیا بۆ مەنعی عیشقی

وەکو سێبەر بە دایم دی بە دووما

سموومی خاوی‌یەی قەهری فیراقی

له تەئسیرا وەکو فەسڵی حەسووما

بیابانی محەببەت جێتە ( خادیم )

بسووتێی گەر بە سۆزی بای سەمووما » ل : (۱۰۱)

دەتوانرێ ئەم پارچە شیعرە له گەڵێ ڕووەوە بە نەشتەری لێکۆڵینەوە شی بکرێتەوەو باسی لێ بکرێ ، بەڵام ماندووبوونی ناوێ کە لەوەی بگەین شاعیر ـ لێرەدا ـ نەفەس سوارو دەسکورتەو بە نقەنق قافیەی بێ ڕێو جێ دروست دەکات • دەنا ئەو هەموو ( زەقووم )و ( سەمووم )و ( حەسووم )ەی بۆچی دەهێنا ؟! زیاد

لەوە لە دیوانی چ شاعیرێکی کوردا ئەو ئەلفە زیادانە ـ بۆ ناچاری ـ لکێنراون بە دوای وشەوە ؟ کام شاعیر بۆ ناچاری ( ئارەزووم ، علووم ، حەسووم ، سەمووم ) دەکا بە ( ئارەزووما ، زەقووما ... تاد ) ؟

● وەك گوتم کاك جەمال باسی سەرچاوەوەی نەکردوە ، هەروەها خۆیشی بە کارەکەوە ماندو نەکردوەو لەگەڵ داوای لێبوردندا دەڵێم : غەڵەتو پەڵەت دیوانەکەی روونووس کردوەو هەر بەو شێوەیش رێگەی چاپی دراوە ، لەسەر ئەم خاڵە تۆزێ دەمەتەقێ دەکەم :

أ ـ کاك جەمال دەڵێ : « ئەگەر لە نووسینی هەندێ وشەدا تووشی هەڵە بووبم هۆی ئەوەیە کە پشتم بە دەسخەتی شاعیر خۆی بەستووە کە دوو نوسخەی ئەسڵییەو لەوە بەولاوە نوسخەی تری نیەو شیعریشی بڵاونەکراوەتەوە ... » ل : ١٢

جارێ نابێ بوونی دەسخەتی شاعیر خۆی هۆی تووشبوونی هەڵە بێت ؛ چونکە ـ زیاد لەوە کە کەم وا رێ دەکەوێ دەسخەتی شاعیر خۆی چنگ بکەوێ ـ کە دەسخەتی شاعیر خۆی بوو ئیتر جێگەی گومانو هەڵەی نووسەری نەشارەزاو دەساودەس نامێنێو : بوونی دەسخەتی ئەسڵی لە کاری لێکۆڵینەوەدا رێگە کورت دەکاتەوەو ئەرك سووك دەکات نەك بە پێچەوانەوە ، قسەم نیە شاعیرەکە خۆی شاعیر نەبێت !

دوای ئەوە کاك جەمال دەڵێ :« شیعریشی بڵاونەکراوەتەوە » نازانم چەند سەرچاوە گەڕاو چەند گۆڤاری پشکنیو چەند رۆژنامەی پەڕەپەڕە

هەڵدایەوە تا ئەم حوکمە بدات ؟ ئەم حوکمەیش وەك حوکمەکانی دیکە هەر ( تەقلەی ئیمام محەمەیی )یە • من بە گەڕانێکی کەم سووكو ئاسان توانیم ئەم حوکمە بدەمە دواوە • بۆ نموونە :

پارچەی (٣٣) ل : ١٠٦ بە ناونیشانی ( وەصفی ئەدەب ) لە ژمارە ١٦٩٥ی رۆژی ٢٧-٩-١٩٦٢ی رۆژنامەی (ژین)دا بلاوکراوەتەوە •

هەروەها پێنج‌خشتەکی ( قەناعەتو عیزەتی نەفس ) بە ناونیشانی ( سەرنجێك ) لە ژمارە ١٦٦١ی رۆژی ٢٥-١-١٩٦٢ی رۆژنامەی ( ژین )دا بلاوکراوەتەوەو لەسەری نووسراوە : ( پێنج‌خشتەکی حاجی میرزا عبداللەی کۆیی ـ خادم ـ لەسەر شیعرێکی کاکەی فەلاح بە ناونیشانی سەرنجێك ) •

هەروەها پارچەی ( دووربینیو بێ هەوایی ) ل : ٢٧١ لە ژمارە ١٦٤٥ی ( ژین )دایەو لە سەری نووسراوە ( پێنج خشتەکی حاجی میرزا عبداللەی کۆیی ـ خادم ـ لەسەر شیعری کاکەی فەلاح بە ناونیشانی دووربینی ) •

هەروەها پارچەی ژمارە (٤)ی ل : ٢٧٤ لە (ژین)دایەو لە سەری نووسراوە : ( پێنج خشتەکی حاجی میرزا عبداللەی کۆیی خادم لەسەر شیعرێکی کاکەی فەلاح بە ناونیشانی بایی بوون ) ژین : ١٦٣٨ •

دیارە نەزانینی ئەم باسانەو نەبوونی ئەم زانیاریانە جگە لەوەی بێ ئەمانەتی تێدایە زیانێکی گەورە لە کاری لێکۆڵینەوەو زانینی مەبەستی راستو دروست دەدات •

جگە لەمانەیش کاك جەمال خۆیشی شیعری خادیمی بلاوکردوەتەوە بەڵام باسی ئەوەیشی نەکردوە (٢) •

ب ـ کاك جەمال لە رزی پێنج‌خشتەکیەکاندا پێنج‌خشتەکی خادیمی لەسەر شیعری نالی‌و مەحوی‌و بێخودو چەند شاعیری دیکە بڵاوکردوەتەوە بەڵام دیسان ئەوەندەی هێز نەداوەتە خۆی چاوێـك بە دیـوانی چاپکراوی ئەو شاعیرانەدا بگێڕی تا ـ هیچ نەبێ ـ لەو بەشەدا لە شیعری ئەو شاعیرانەدا نەکەوێتە هەڵەی زەقەوە •

راستکردنەوەی شیعری ئەو شاعیرانە زۆری دەوێ‌و ئێرەیش کەمی بە بەرەوەیەو شوکور ئەوانە دیوانی پوختیان هەیەو هەرکەسـ بیەوێ دەتوانێ شیعرەکانیان بە راستی بخوێنێتەوە • بۆ ئـەم لایەنەیشـ تەنهـا نموونەیەك دەهێنمەوە : کاك جەمال لە پێنج‌خشتەکی ژمارە ( ١ ) ی ل : ٣٠٨ دا کە لە سەر شیعری ( نالی ) یە بەیتێکی نالی بەم شێوە نووسیوە :

سوروشکم ئاب‌و دانەی نارە ، کێ دی
بە گەرمی داوەری بەم تەرزە تەرزە

بەڵام راستی بەیتەکە لە دیوانی نالی‌دا ئاوایە :

سورشکم ئاب‌و دانەی نارە ، کێ دی
بە گەرمی داوەرێ بەم طەرزە تەرزە ؟! (٣)

● کاك جەمال دوو ناونیشانی بە خەتی رەشی گەورە داناوە : ( پلەی شاعیرێتی •• ) ل : ٢٥و ( شیعری حاجی میرزا عەبدوڵلا لە پلەیەکدایە ) ل : ٣٩ چاوەڕوانی ئەوە دەکرا کاك جەمال لەم دوو جێگەدا هەندێ شیعری حاجی میرزا هەڵسەنگێنێ‌و پلەی شاعیرێتی خادیم دەربخا ، بەڵام لە هەندێ باسی ناوەرۆك بەولاوە هیچی تری پێ نەکراوەو خۆی لە بواری ناونیشـانەکان نـەداوە • لە کۆتایی باسە دووەمەکەدا دەڵێ ( زۆربەی شیعرەکانی تری کە کۆمەڵایەتی

نیشتمانپەروەریی‌و پەندو ئامۆژگاری رووداو پیاهەڵدان (!) شیعری موناسەبەت‌و نامەکاری ـمان هەڵگرت بۆ بەرگی دووەم تەنیا قەسیدەیەکی نیشتمانپەروەری ئەخەینە رو ) ل : ٣٩ ، کەچی دوایی ئەم قسەیەی خۆی لەبیردەچێ‌و قەسیدەکە دەبێ بە دوان وەك دەڵێت : ( یان لە قەسیدەیەکی تردا ئەڵێت ) ل : ٤٠ •

- کاك جەمال جگە لەوەی دیوانی شاعیری شێواندوە ئەوەندەیش کە خۆی نووسیویە کوردیەکی بێقۆرت‌و گرێ‌و گۆڵە نیەو پێویستی بە کونارو هەڵپاچین هەیە تا دێتە رزی کوردی رەوان • وەك : ( هەمیشە لەگەڵ شاعیرەکانی تردا خەریکی ئاڵوگۆڕی شیعر کردن بوو ) ل : ١٤ •

یان وەك ئەڵێ :

( ئەم قەسیدەیەی لە پێش مردنیا داناوە بە (١٢) رۆژ واتە لە ٢٣ ـ ١٢ ـ ١٩٧٠دا وتووە ) ل : ٢١ •

- ئەوەی لە دیوانی خادیمدا جێگەی باس‌و خواستەو ـ ئەگەر بۆم کرا ـ دەگەڕێمەوە سەری ئەوەیە کاك جەمال زۆر جێگەی شیعرەکانی خادیمی بۆ نەخوێنراوەتەوەو بە هەڵە هێناویەتیەوە سەر رێنووسی کوردی‌و لەوەدا گەلێ ئاڵۆزی کەوتوەتە ناو شیعرەکانەوەو دیوانەکە شێواوە • زیاد لەوەیش گەلێ هەڵەی رێنووس‌و نەبوونی یەك رێنووس بارێکی ترن سەرباری ئاڵۆزی‌و شێواندنەکەن • ئەمانە زیاد لە گەلێ هەڵەی چاپ کە بوونەتە سەرباری سەربار !

جا لەم بەرکوڵەدا هەروا بە سەر ئەو هەڵانەدا ناڕۆین‌و چەند نموونەیەك دەخەینە روو ؛ بەڵام ئەمانە هەر نموونەن‌و لەچاو هەڵەی

تێکڕادا بە سووچێکی زەکاتیشدا ناگەن •

★ هەر [ کو لە شیوە ] هاژە ئەکا ئاو بە ناویا
هەر کانی ئاوی وشکە بە جارێ ژیایەوە [ ل : ٤٩ ]

ئاشکرایە کە [ کو لە شیو ] هەڵەیەکی زۆر زەقەو کاك جـەمال مەبەستی شاعیری نەزانیوەو لە خۆیەوە ئەوەی بە بیردا هاتوەو رووونووسی کردوە ، شاعیر مەبەستی ( کۆڵە شیو - شیوە کۆڵە )یە ، (شیوە کۆڵە)و ( چەمە کۆڵە ) ماڵو پیاوی شارەزوور دەیانزانێ •

★ نەغمەیی تاری [نەفس] موژدەی ویساڵی دولبەرە [ل : ٨٥]•دیارە [ نەفس ] هەڵەیە ( نەفەس ) راستە •

★ میسالی حافزو سەعدی نەبوو بێ [ تویشە ] بێتووشی
رفاندی [ گوێی ] هونەرمەندی لە هەردوو لا لە مەیدانا

[ ل : ٩٥ ] • دیارە (تویشە) ( توێشە ) یەو (گوێی) (گۆی) ە •
هەر لەو لاپەڕەدا نووسیویە :

★ لە [ لایی ] نالیو مەحوی لە ( لایی ) سالمو کوردی
لە لایێ [ عالەمی ] عامیل کە جێگەی فەخرە مەولانا ( ل : ٩٥)

ئەوە روونە ( لایی ) لە هەردوو لادا هەڵەیـەو ( لایێ ) راسـتە •
هەروەها ( عالەمی ) ( عالمی ـ عالیمی ) یە •

★ تەغافول [ تا بکەی ] ئەی دڵ لە مەولا روو لە مەولاکە [ ل : ٩٤ ]
ئەمەیش دەبێ ئاوا بنووسرێ :

تەغافول تا بەکەی ئەی دڵ ؟! لە مەولا روو لە ( مەولا ) کە • ئـەم ( تابەکەی )ە گەلێ جار بەم شێوە بە هەڵەی دەنووسێ •

★ [ شۆرشی ] شێتیم کەوا کەوتووەتە بازاروو سوقاق • ل : ۹٦ •
ئەمەیش ئاشکرایە ( شۆڕشی ) نیەو ( شۆرەتی )یە • جارێ ناچمە
ژێر باری لیستەی هەڵەی رێنووس‌و دەمەوێ چەند نموونەی هەڵەی
فەرهەنگەکەیش بخەمە روو :

لە ل : ۳٥۱دا دەڵێ : ( خاتیمە :

۱ ـ دوایی ، پایان ، کۆتایی
۲ ـ ئەموستیلە
۳ ـ مۆر •

( خاتیمە ) تەنها بۆ خاڵی یەکەم دەگونجێ‌و ( ئەموستیلە )و ( مۆر )
( خاتەم ) ن نەك ( خاتیمە ) •

بیکر : ئافرەتی نەسمراو ، کچ • ل : ۳٥٦ •

جارێ دەبێ ئەوە بزانین کە لەو قەسیدەدا ئەم وشە واتە ( بیکر )
زۆر لەو مانا دوورە کە کاك جەمال بۆی نووسیوە ؛ چونکە شاعیر دەڵێ :

( خامەم لە فیکری بیکرو مەعنەوی ••• ل ٥۰ ) دیارە لێرەدا مەبەست
مانای تازەو نەبیسراوە نەك کچی نەسمراو ! زیاد لەوەیشس ئەمە دوو
هێشمەیەو کارێکی دوو پاتی بێهوودەیە ؛ چونکە کاك جەمال لە ل :
۱۸ یشدا مانای بیکری لێداوەتەوەو ماناکەی ئەوێی رەساترە •

ما لایعنی : شتی بێ سوود ، بێ واتا • ل : ۳٥٦ • ئەمەیش هەڵەیەکی
زەقەو وا ئەبێ شتێ بەلای کەسێکەوە ( ما لایعنی ) یە بە لای کەسێکی
دیکەوە ( یعنی ) و مەبەستە • واتە ( ما لا یعنی ) شتێکە تۆ مەبەستت
نەبێت‌و کارت پێیەوە نەبێ با خەڵکی تر کاریان پێیەوە بێ • ئەمەیش لە

حەدیثێکی پێغەمەردا ـ د روونە کە دەفەرموێ : ( من حسن اسلام المرء ترکه ما لا یعنیه )•

وادی : نێوان دوو شاخ ، دۆڵ • ل : ٣٦٥ • نێوان دووشاخ قۆپیەو (وادی ) شیوە •

مەعمار : ئاوەدان کردنەوە • ل ٣٦٨ • ئیعمار ئاوەدان کردنەوەیە ، مەعماریش نی یە ، میعمارەو میعمار ئاوەدان کەرەوە یان ( بەنا ) خانوسازە

وەیشوومە : سەر بە بەڵا ، نەگبەتی • ل : ٣٧١ •

وەیشوومە : بایەکی ساردی زستانە ، بدا لە هەر سەوزیو شیناوەرییەك هەڵی دەپڕووکێنێ ، بەڵاو نەگبەتی نیە •

عەقیق : بەردێکی سووری بلوورینی بەقیمەتە ، گەلێ رەنگی هەیەو ئەکرێ بە موستیلە • ل : ٣٧٢ •

جارێ کە گوترا ( سووری ••• ) و ئەوە بڕایەوە کە رەنگی سوورە ؛ چۆن دوایی دەڵێ : ( گەلێ رەنگی هەیە ) ؟ دوای ئەمەیش ( عەقیق ) ناکرێ بە موستیلە ؛ بەڵکوو دەکرێ بە نقێمو ناوی موستیلەو گوڵو خشڵی زێڕی ئافرەت •

وەك لە پێشدا وتم سەرنجەکانم بۆ بەرگی یەکەمی ( دیوانی خادیم) گەلێکن و ، لق و پۆپیان زۆرەو زۆریان دەوێ ، لەم بەرکوڵەدا بەم ئەندازە دەسبەردار دەبم و لایەنەکانی دیکە وەك هەڵەی رێنووس و ، هەڵەی چاپ و ، هەڵەی ئایەت و ، مانای ئایەتەکان و ، کێشی شیعرەکان و هەڵسەنگاندنی بەرگی دووەمیش بۆ هەل و دەرفەتێکی دیکە هەڵدەگرم •

**پەراوێزەکانی :-**

(١) بڕوانە دیوانی خادیم ، حاجی میرزا عەبدوڵڵای کۆیی ، بەرگی یەکەم ، جەمال محەمەد محەمەدئەمین ئامادەو ساغی کردوەتەوە • بڵاوکراوەی دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی •

(٢) بڕوانە : پاشکۆی عیراق ژمارە ٣٢ ت - ٢ - ك ١ ، ١٩٧٩ ، هەروەها بڕوانە : بەیان ژمارە ٦٠ ، مارتی ١٩٨٠ •

(٣) جگە لەوەیش کە سۆران مەحوی شیعری خادیمی لە ژمارە (٢٧)ی حوزەیرانی ١٩٧٩ ی پاشکۆی عیراقدا بڵاوکردوەتەوە •

(٤) بڕوانە : دیوانی نالی ، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس‌و فاتح عبدالکریم ، بەغدا ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، ل : ٤٨٨ •

## لە كۆچی دواییی عەبدوڵلا جەوهەردا

ع. ح. ب.

وەك پەپوولەو ئاوی مەنگ
ئەهاتو ئەچوو بێ دەنگ
لە هەڵسان و ژیانی
کەم کەس شتی ئەزانی
هەرچەند بە لەش لاواز بوو
بۆ قۆزتنەوەی خەم ساز بوو
هەر لە سەرەتای لاویوە
کوێرەوەریی ئەچنیوە
بیدییایە ناسیاوێ ،
لێقەوماوێ ، داماوێ
دەستی کورتەو نییەتی
لێی ئەورووژا مەینەتی
هەرچەندی پێ بکرایە ،
لە ماڵ ، لە شت ، ئەیدایە

که کتێبی ئەکەوتە بـازاڕ
( جەوهەر ) بوو یەکەم کڕیار
وێڵ ئەبوو بۆی ، نەئەسرەوت
هەتا بە دەستی ئەکەوت
تا بڵێی ڕۆشنبیر بوو
ورد بوو هێمن بوو ، ژیر بوو
وەك سندووقی داخراو
ناخی پڕ بوو لە زووخاو
پڕ بوو لە کەم دوێنی
لە کۆمەڵێ نهێنی
هەمیشە چەشنی بورکان
ئەکوڵاو هیچی نەئەدرکان

★ ★ ★

لە ڕۆژێکا ( گەلاوێژ )
تیشك بوو ، پرشنگ هاوێژ ،
پێنووسی ( جەوهەر )ی لاو
ڕوونیەکردەوە بەرچاو
شادیو هیوای ئەڕەخسان
تەڵەو داوی ئەپسان
( ع ۰ چالاك ) بوو نازناوی
لەو ڕۆژانەدا بـاوی

★ ★ ★

بۆ یەکەمجار پێنووسی
کۆرپەی ( ئاوات )ی نووسی
هەرچەن ئاواتی ساوا
خنکا لەناو زەلکاوا ،
بەسەر شەپۆلی باوە
تا ئێستاش ناوی ماوە

* * *

( جەوهەر ) بەڕاست جەوهەر بوو
کاڵای خاوێن لەبەر بوو
بەرگەگرو ئازا بوو
دانا بوو ، شارەزا بوو
ڕۆڵەیەکی پوخت بوو
کوردێکی یەك گفت بوو
وەك بەفری سەرکەل پاك بوو
دەروێشی ئاوو خاك بوو

* * *

کە پرسێکی لێ ئەکرا
دەربارەی توخمی گوڵێ
وەك دڵسۆزێ ، وەك برا
ئەیزانی : چۆن ، چی بڵێ

* * *

وەك ئەڵێن سەرەتای لاوی
کیژێـکی خۆشویستووە

لەبەر جێو گەورە ـ ناوی
بۆ ئەمی هەژار نەبوە
وەك چۆن ئاو ئەبڕێ لە گیا
وشكو پەژموردە ئەبێ
مردووەو لەگەڵ خۆیا
دڵی ئەمیش هەڵئەگرێ

★ ★ ★

ئەمیش وەك وەفادارێ
ڕاستگۆییی لێ بارێ
دوای ئەو باڵا لاولاوە
وازی لە ژن هێناوە

★ ★ ★

وەك هاوڕێ یـا وەكوو دۆست
هاوبەشی شادیو هەم كۆست
لەگەڵ یەكا تێكەڵ بووین
جار جار بۆ لای یەك ئەچووین
جگە لەوەش بۆ منداڵ
هەم كاكەیان بوو هەم خاڵ
كە ئەهات مانگی جارێ
پێی بوو دیاریی دەست ، بارێ
منداڵان ڕایان ئەكرد

شتەکانی دەستیان ئەبرد
ئەمیش ورد ورد ئەیدوانن
بە زمانێ بیزانن ••

★ ★ ★

ئەم پیاوە
ڕوون وەك ئاوی سەرچاوە
دیار بوو بە بەرچاوەوە
ئەسووتا لە ناوەوە
لەم دواییەدا نەخۆشی
تێی ئالاو گرتی‌یە کۆشی
شێرپەنجەی چارە گران
چووە ئێسکی‌و بوو بە ژان
لە ئازاریا نوقووم بوو
ماوەی نەدا بۆ پشوو
لە تیمارخانەی بەغدا
بێ‌هۆش‌و گۆش‌و ئاگا
دەمی کەوتبوو لە گۆ
لەشی درابوە بەر چەقۆ
لە پزیشکەکەیم پرسی :
لێی ئەکرێ مەترسی
پێی وتم لە وەڵاما :
ئەگەر ئەمڕۆو سبەی ما
بە سەر زیندوو ئەنوێنێ
ماوەیەکی‌تر ئەمێنێ

★ ★ ★

لەوێ لە سەرەمەرگا
هەزار برین لە جەرگا
کە چاوی تێئەبڕیم شەو
لە دوو چاوم ئەفڕی خەو
ئەمخوێندەوە لە چاویا
هەزار پرسیاری جیا جیا
ئـاخۆ ئەژی ، یا ئەمرێ ؟
بەرگەی ئەم دەردە ئەگرێ ؟
یا جارێکیتر بـە پێ
بەناو شارا ئەگەڕێ ؟
سەربەست وەك زوو ئەتوانێ
بۆ دەرو دەشت بڕوانێ
وەیا مەرگ ڕێگەی نادا
چاکی لێ بکا بە لادا
بچێ بۆ کوێ زۆر خۆشە
بزوێنی هەستو هۆشە
بۆ خۆی لێی دانیشێ قنج
چاوی پڕ کا لە سەرنج
مل لەژێر دەمی شیرا
زۆری ئەهات بە بیرا
ئەگەر هاتو ئەمجارە
بۆی دۆزرایەوە چارە
ئەگەر ئازارەکانی
ئەمجارە وازیانهانی

ئەمجا وەك تازە لاوێ
پەل‌وپۆی بەرز ئەهاوێ ..

* * *

بەڵام ، ئاخ ! ئاخۆ مردن
ڕێی ئەدا بۆ هیچ کردن
وەك بەفری کۆنی بەتاڵ
بێ‌ورەو هێزو ئارام
هێنرایەوە بەرەو ماڵ
لاشە پڕ برین‌و زام

* * *

لە باوەشی ماتەما
خۆی لە ئازار ئەپاراست
ئەو ماوە کەمەی کە ما
ئاواتی مەرگی ئەخواست

* * *

بەم‌شێوەیە ئەتلاوە
تا ئەستێرەی کوژاوە
تا هەردوو چاوی گەشی
نووست‌و تیا نەما ڕەشی
تا دڵی گەورەو نەرمی
پڕ لە بەزەیی‌و شەرمی
لە جووڵەو لە لێدان کەوت
بۆ هێجگاری ( جەوهەر ) خەوت

١٩٨٣-٢-٢٠

# چەند دیاردەیەك لە ڕەخنەی ئەدەبیی کوردیمان

نووسینی : ڕەووف بێگەرد

زۆر جار باس لە ڕەخنەی ئەدەبیی کوردیمان بۆتە جێگای دەمەتەقێو مشتومڕی ناو نووسەران ، چ لە دانیشتنی ناو کۆڕو کۆمەڵی ئەدەبیو ، چ لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارە ـ کوردی‌یەکان . ڕادەربڕینو چەندو چوون لەسەر کردنی ئەم بابەتە ئەدەبی‌یە گرنگە .. بەتایبەت بۆ ئێمە زۆر پێویستو بایەخدارە . ئەگەرچی سەرنجەکان لای هەندێك تەنیا بۆتە پیاهەڵدانو پەسەندکردنی ڕەخنەی ئەمڕۆمانو ، جاری‌وایش بووە خراونەتە ڕیزی ڕەخنەی ئەدەبیی هەندێك میللەتی پێشکەوتووەوە ، بەڵام لای هەندێکیش بەپێچەوانەوە ڕەخنەگرانیان بەرەو ڕووی لێ‌پرسینەوەی گەورە کردۆتەوەو گەلێك خەوشی ڕەخنەی ئەمڕۆمانیان پێش چاو خستوون . لەمدواییەشدا بەڕێز دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی ـ هاوکاری ـ زنجیرە وتارێکی لەمبارەوە نووسی . دکتۆر وەك شارەزاو مشوورخۆرێکی ئەم بابەتە دەستی خستبووە سەر هەندێك لایەنی ئەو کەمو کووڕی‌یانە . بەڵام بەگشتی وتارەکان ـ عمومیات ـی ڕەخنەیان پێوە دیار بوو ، کە

ده‌بـوا زیاتر بنووسـایه به پراکتیکی ڕه‌خنه‌ی ئـه‌ده‌بیی کوردیمـانه‌وه
چونکه ئه‌مه‌یان گرفتی ئه‌مڕۆیه‌و مه‌رجه سه‌ره‌کیه‌که‌ی نووسینمانه ، بۆیه
به پێویستم زانی منیش ڕاکانی خۆم بخه‌مـه سـه‌ر ئـه‌و سه‌رنجانـه‌و ،
به‌وهیوایه‌یش بکه‌وێته خانه‌ی په‌ره‌پێدان‌و به‌ره‌وپێش‌بردنی ئه‌م بزوتنه‌وه
ئه‌ده‌بیه‌ی نه‌ته‌وه‌که‌مان •

کاری ڕه‌خنه توێژینه‌وه‌و هه‌ڵسه‌نگاندنه ، تاووتوێ کردنی به‌رهه‌می
ئه‌ده‌بی‌یه له‌به‌ر ڕووناکی ئه‌و بارو سه‌رده‌مـه‌ی سـه‌ری تیا هـه‌ڵداوه ،
دیاری‌کردنی ئه‌و لایه‌نه ڕوون‌و لێڵانه‌یه که ده‌ستیان هه‌بووه له خامه‌ی
نووسه‌ردا ، ره‌خنه‌گر خاوه‌ن میراتێکی رووناکبیری‌و هونـه‌ره‌و ، لـه‌و
پێوانه ره‌خنه‌یی‌یانه‌وه ده‌ستپێ‌ئه‌کات که له‌و میراته‌وه پێی گه‌یشتووه •
بێجگه له‌وه‌ی که له بنه‌ڕه‌ته‌وه خاوه‌ن سه‌لیقه‌ی ڕه‌خنه‌گرانه‌و سه‌رنجی
ورده ، چونکه هه‌موو ڕووناکبیرێك نابێته ڕه‌خنه‌گر ئه‌گه‌ر ئه‌م سیفه‌ته‌ی
تیا نه‌بێت • قووڵ‌بوونه‌وه له کاری ئه‌ده‌بی به‌نیازی دۆزینه‌وه‌ی نـوێ‌و
په‌ل‌وپۆهاویشتن ته‌نیا به‌م‌نیازه ، سـیفه‌تی ڕه‌سـه‌نایه‌تی ڕه‌خنـه‌گـره‌و
به‌ڵگه‌ی هه‌ست به لێ‌پرسینه‌وه کردن‌و دڵسۆزی‌یه‌تی بۆ کاره‌که‌ی‌و بۆ
مێژووی ئه‌ده‌ب •

که ئه‌مه‌مان کرده بنه‌ماو هاتینه سه‌ر ڕه‌خنه‌ی کوردی ئه‌بێ لاڕێ
سه‌رمان‌پێ هه‌ڵنه‌گرێت‌و شارێگا به‌جێ نه‌هێڵین • چونکه ره‌خنه‌یش وه‌ك
هه‌ر کارێکی ئیبداعی‌تر سه‌ر به بارو سه‌رده‌می تایبه‌تی خۆیه‌تی‌و ڕه‌خنه‌گر
سۆپه‌رمانی جیهانی ئه‌ده‌ب‌و هونه‌ر نی‌یه • ڕه‌خنه له هه‌موو شـوێنێکدا
پاش کاره ئیبداعی‌یه‌کان چاوئه‌کاتـه‌وه ، واتا ئه‌گـه‌ر چیرۆك‌و شیعرو
[illegible]

لەناو کرۆکی ئەمانەدا جیهانی زیندوو دروست ئەکات و دۆزینەوەی ناوازە دێنێتە کایە ، ئەگەر وانەبوو ئەوا لێکدانەوەی ساکارانەو تەفسیری ڕواڵەتی ناچنــە خانــەی ڕەخنــەوە • ڕەخنــەی ئێمــە وەك کارە ئــەدەبی و هونەریەکانی ترمان ڕەخنەی کوردن و تەمــەنی نووســینی ڕەخنــەیمان کورتە• ئەگەر شێخ نوری شێخ صالح بە دامەزرێنەری سەرەتای دابنێین و ڕەفیق حیلمی بخەینە قۆناغی گەلاڵەبوون و دەرچوون لە بنەما بەلاغی یەکانی عەرەب و سەرکێشمان بەرەو بنچینەکانی ڕەخنــەی ئــەورووپایی ، ئــەوا دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ زانستیانەتر دەست بۆ ئەم لایەنە ئەبات و ڕێگایش خۆشتر ئەکات بۆ ئەوانەی قەڵەمی ڕەخنە لە دەســت ئەگرن • لە ساڵەکانی حەفتایشەوە هەندێکی تر قەڵەمی ڕەخنــەو لێکۆڵینــەوەیان خستۆتەگەڕ و زۆرو کەم تیایاندا هەیە جێ پێیەکی بۆ خۆی خۆش کردوە کە بە ڕای من دیارترینیان کەمال میراودەلی یە •

بەڵام بەگشتی تائێستا ڕەخنەی کوردی خۆی نەچەسپاندووەو وەك کارە ئەدەبیەکانی ترمان خاوەن قەوارەو خاسیەتی خۆی نیە • وەك پێشتر باسمان لێوە کرد تەمەن کورتی و گەشــەنەکردنی بارە زانســتیەکانمان دەوریان لەملایەنەدا هەیە ، بۆیە زۆربــەی زۆری ئــەو نووســینانەی ئێستامان هەوڵدانن و لە قۆرت و نووچدان خاڵی نین • بەڵام سووربوون لەسەر ئەوەی « ڕەخنەی کوردیمان چاکــەو پێ بــەپێی کاری داهێنــان هەنگاوی ناوە » جێی مەترسی یەو دیاردەیەکی خۆخەڵەتاندنە • من ناڵێم هەوڵەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی کاری باش نین و ســەرنجی چاکیان تیانی یە ، بەڵام کەمیان مەرجی ڕەخنەیان تیا بووەو زۆربەیان دەکەونــە گۆشەی سەرنج و ڕای سەرپێیی یەوە • خەوشی ڕەخنەگرانی ...

ڕەخنەگرەکانمان لە ڕوانگەی تیووریی وشکەوە دەستپێدەکەنو ناتوانن لە خودی کارەکەوە داهێنانی خۆیان دروستبکەن • ڕەخنە لە دوو لاوە سەرچاوە دەگرێت : یەکەمیان ئەو ڕووناکبیری‌یە زانستی‌یەی هوشیاریی هونەری‌و فیکری دەداتە ڕەخنەگر ، کە ئەمە لەدەرەوەی کارە ئەدەبی‌یەکەوەیە • دووەم لە خودی بەرهەمەکەوە کە چەندە وردەکاری سەلیقەی ڕەخنەگر توانیویەتی بچێتە قووڵایی کرۆکو ئوسلووبی شکۆداری بەرهەمەکەوە • بەداخەوە لە زۆربەی کارە ڕەخنەیی‌یەکانماندا هەست بەوە دەکرێت کە ڕەگەزی دووەم ونەو ئەگەر ئەو ڕەخنەیە ببڕێتە بەری هەر کارێکی‌تری ناکوردیش بۆی دەبێتو ڕەنگە تەنیا ئەرکی ناو گۆڕینەکەی هەبێت • بێجگە لەوەی کە ڕەخنەگرەکانمان نەیان‌توانیوە هەردوو جەمسەرە سەرەکی‌یەکەی شێوەو ناوەرۆك بە یەك بگەیەنن‌و زۆربەی هەرە زۆریان ڕەخنەی ناوەرۆکەو ئەگەر پێیان‌بڵێیت ئەی ئوسلووب‌و لایەنی هونەری ؟ دەڵێن : « ئەم تەداعی‌و مەنەلۆجە چی‌یە هەموو جارێك دووبارە بکرێتەوە » • وەك هونەری چیرۆکنووسین تەنیا ئەمانە بن‌و ئیتر ساختمان‌و زمان‌و وێنەو تەکنیکە ئیبداعی‌یەکان هیچ نەبن •

ڕەخنەگری بەتوانا سەر بە هەر ڕێبازێکی فیکری‌بێت ئەتوانێت لە بەرهەمی گەورەدا کە ڕەنگە لەگەڵ ڕێبازەکەیشیدا نەگونجێت ئیبداع بکات‌و دۆزینەوەی نوێ بەدی‌بهێنێت، بەڵام‌بەداخەوە ڕەخنە لای ئێمە وەك ململانێ‌و کێشمەی دوو پارتی سەیردەکرێت • زۆرجار ڕەخنەکان دەبنە وتاری تیووریی ڕووت‌و هەرچی جوانی‌و داهێنانی هونەری هەیە گوێیان پێ نادرێت ، هەر لەبەرئەوەی بیری ڕەخنەگر لەگەڵ

ڕاستو چەوت بەسەر بەرهەمەکەدا بهێنێت ، بەپێچەوانەیشەوە گەلێك جار بەرهەمی نابووتیان لە خەڵکی کردۆتە شاخو بە پای پیلان پیایاندا هەڵداوە ، ئەم مەسەلەیە گەیشتۆتە سنوورێك کە هەندێك لەو ڕەخنەگرانە گوستاخانە حوکم ئەدەنو هەست بە هیچ لێپرسینەوەیەك ناکەن ، ناشاعیر ئەکەنە شاعیرو ناچیرۆکنووسیش بە چیرۆکنووسی هەڵکەوتوو ، حال گەیشتە ئەوەی تەنانەت ئەو چیرۆکانەیش کە تائێستا نە زۆربەی هەرەزۆری جەماوەرو نە زۆری نووسەرانیش نە تێیان گەیشتوونو نە لەبەر ئەم بەرو ئەوبەرپێ کردنو تەموومژ سەریان لێ دەرکردوە کرانە ( ئەدەبی میللەتو سەردەمو لە چوارچێوەی نەتەوایەتی دەرباز بوونو مۆرکی جیهانییان وەرگرت ) • هەروەها ئەو چیرۆکە ڕەمزییە داخراوانەی کە زوربەی هەرەزۆری نووسەران لەوباوەڕەدان ئەدەبی ئەم سەردەمەی میللەت نینو کەس تێیان ناگات کرانە ( ئەدەبی ڕوونو ئاشکرا کە خوێنەرێکی ئاسایی تێیان ئەگات ) • من لەوباوەڕەدام کە هەندێك لەم ڕەخنەگرانەی لای ئێمە ئاگاداری ئەو کەلە نووسەرانەیش نین کە ئەمان گوایا سەر بە ڕێبازی فیکرو قوتابخانەی ئەوانن • چونکە ئەمان گەلێك بە بێزەوقیو وشکی ئەڕواننە ئەدەبو زیاتر بۆ شانەیەکی سیاسی دەستئەدەن وەك لە ئەدەب • بێجگە لەوەی بۆ مەبەستی تایبەتیی خۆیان چاووڕاو لەگەڵ جەماوەردا دەکەنو بە ئارەزووی خۆیان نووسەرێك لە واقیع دائەبڕنو یەکێکی تر ئەخەنە بەرەی جەماوەرو دیاردەی وەهمی دروستئەکەن • من دەڵێم ئەگەر ئەمڕۆ تاقە شانازییەك بۆ چیرۆكو ئەدەبی کوردی بەگشتی هەبێت ئەوەیە کە دەربڕینە لە خولیاو ئازارەکانی میللەتو پەیوەستیەتی بەم خاكو خۆڵەوە ، کەچی هەندێك لەم ڕەخنەگرانە زۆر بە ڕەهایی دەڵێن ( ئەدەبی چیرۆکمان دوورە لە کێشەی سەرەکیو ئاواتو خواستو ...

ئەدەبی سەروەر ئەدەبێکی بەرەڵاو نامەقـوولو وجودیو فرۆیدیـە ) •
هەروەها زاراوەی عەبەسیەتو نەهلیستییەتیشی تێوە ئاڵاو بۆ ماوەیـەك
هاتو هاواریك بوو نەبێتەوە • تاقە مەبەستی ئەم رەخنەگرانە ئەوەبوو بۆ
مەبەستی تایبەتی خۆیان خوێندەوار لە هەندێك نووسەر دوودڵ بکـەنو
چێژە - ئەدەبی‌یە کەیشیان بگۆڕن • من دەڵێم ئەگەر تاکە تاکەیەك لەو
بابەتە ئەدەبی‌یانە ڕووی‌کردبێتـە ناو بەرهـەمی کوردی‌یـەوە گەلێـك
ئاسـایی‌یەو هـەرگیز نەبۆتـە دیاردەو ئـەدەبی باو • خـۆ ئـەگـەر
رەخنەگرەکانمان بیان‌توانیایەو مەبەستە شەخسی‌یەکە بڕستی نەبڕینایـە
ئەیان‌توانی تەفسیرێکی ژیاریانەی وایان بۆ ئەو بەرهەمانە بکردایە کە لە
بەرژەوەندی بیرو ڕێبازی ئەدەبی‌یاندا بوایەتە خەرمانێکی پوختی داهێنانی
مەیدانی ڕەخنەکاری • ئـەمان بەدەسـتی ئەنقەسـت ئەو بەرهـەمانـەو
خاوەنەکانیان خستە بەرەیەکەوەو کردیاننە سەرە هەرە جیاوازو دژەکەی
خۆیان • کە ئەمە لای رەخنەگرە مەزنەکانی دونیا بەپێچەوانەوەیـەو ،
ئەوان هەمیشە مەبەستیان بووە کارە ناوازو نووسەرەکانی‌دیش لە ڕێبازی
خۆیان بەدەرنەخەن • تەنانەت ئەو نووسـەرانەیشـی کە هـەندێك لـە
رەخنەگران لای ئێمە دان بە حەقیقەتی ئەدەبیاندا نانێن لای ئەوان جێگای
بایەخو ڕێزلێنانن، بۆنموونە رەخنەگری سۆڤیەتی - بۆریس بۆریسۆف-
لە کتێبە ڕەخنەیی‌یەکەیدا - ( ڕیالیزم ئەمڕۆو هـەمیشە ) کە باسی لـە
« ئەلبێر کامۆ »ی عەبەسی ئەکات هەرگیز هونەرمەندیو گەورەییی ئەم
نووسەرە پشت‌گوێ ناخات ، تەنانەت ئەدەبەکەیشی بە واقیعی دائەنێت ،
چونکە ڕاستەوخۆ پێوەندی بە مرۆڤەوە هەیەو ئیلتیزامی تیایە ، بۆ ئەمـە
رۆمانی ( تاعوون ) ەکەی بەنموونە دێنێتەوە • هـەروەها ( کافـکا ) بـە
هونەرمەندێکی مەزن ئەداتە قەڵەم ، لەکاتێکدا کە ئەدەبی کافکا بریتی‌یە
... ئیزدواجی‌یەت • کە باس لە ئەدەبی

وجوودیش دەکات پێ لەو ڕاستی‌یە ئەنێت کە ئەم ئەدەبە بەشداری لە زۆر لایەنی سایکۆلۆژی‌و ژیانی ناوەوەی مرۆڤدا کردووە •

هەروەها دەوری مۆدەرنیزمی‌یەکانی ( ڕۆمانی نوێ ) یش فەرامۆش ناکات • دیسان ڕەخنەگری سۆڤیەتی ( دیمیتری زاتۆنسکی) کە دێتە سەر لێکدانەوەی بەرهەمەکانی کافکا هەرگیز لەو واقیعەی جیاناکاتەوە کە کافکای تیا ژیاوە ، نووسەرێکی بێ‌نیشتمان ، دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی هەنگاری ـ نەمساوی کە لەوپەڕی شڕی‌و بەرەلایدا بووە، پێکدادان‌و جیاوازیی چینایەتی ، بەگژداچوون‌و کێشەکانی نەتەوایەتی ئەو سەردەمە ، بە لای زاتۆنسکی‌یەوە ئەمانەن لە ئەدەبی کافکادا ڕەنگیان داوەتەوەو ئەو جیهانە تایبەتی‌یەیان دروست‌کردوە ، کەواتە کافکا لە واقیع نەپچڕاوەو نوێنەری ڕاستەقینەی سەرێکی ڕووداوو کارەساتەکانی ئەو سەردەمەیە • بوریسۆف لە باسی دۆستۆیفسکی‌یشدا پێی‌دەلێت • « ئەو نووسەرە بلیمەتەی ڕەگ‌و ڕیشەی لەم ولاتەدایەو کوڕی ڕاستەقینەی میللەتی ڕووسە » •

ئەمە نموونەیەکی زۆر کەم بوو لە بیرو لێکدانەوەی کەلەڕەخنەگرانی ڕێبازی ڕیالیزمی‌سۆشالیست‌و چەندان نموونەی‌وامان لە بەردەستایە • کەچی لای ئێمە ڕەخنەگری‌وامان هەن وا بیردەکەنەوە ئەدەب‌و هونەر بە بەشێك دەزانن لە کەرەسەی پروپاگەندەی ڕەسمی • لای ئەمانە نرخی هەر کارێکی ئەدەبی‌و هونەری لەوەدایە چەند سوود دەگەیەنێتە دەسەلاتە سیاسی‌یەکەو هیچی‌دی • کەواتە ئەدەب کە ئامانجی سەرەکی دۆزینەوەی حەقیقەتە ئینسانی‌یەکانەو تەعبیرە لە خولیاو ئارەزووەکانی مرۆڤ‌و جوانی‌و خاوێنی‌یەکانی سەرجەم ژیانی مرۆڤایەتی ، ئەمانە هەموو لەدەست ئەدات‌و دەبێتە پۆستەرێکی پروپاگاندە

ناهەموارو بێتام • ئـەم دیاردەیـە کـە کاری کردۆتـە سەر هـەندێك ڕەخنەگری لای ئێمە لە بواری ئـەدەبو هونـەردا وەك زاراوەیـەکی لێهاتووە کـە یەکسـان بێت بـە دۆخی تۆقانـدنو هـەڕەشـە کردنو سەربەستی بڕینی ئەدیبو هونەرمەند •

دیاردەیەکی تری خەوشی ڕەخنەی کوردی جیانەکردنەوەی بابەتە ئەدەبییەکانە لە یـەکترو تێکـەڵاوکردنی ئەرکو مـەوداو تایبەتیـەتی هەریەکەیانە • بۆنموونە لە ژمارە ( ٤ )ی گۆڤاری کارواندا ووتارێکی ڕەخنەیی نووسراوە بە ناوی (پاڵەوانو ڕووداو لەچیرۆکی کوردیدا ) • نووسـەر هەر لە سەرەتایوتارەکەیدا کۆمەڵێك ناوی کەڵە ڕۆماننووسانی جیهانی ڕیزکردووەو ، لەگـەڵ چەند کورتـە چیرۆکنووسـێکی کـوردا بەراوردیان ئەکات ، کە ئەمە لەخۆیدا کەلێنێکی گەورەیە ، چونکە هیچ نووسەرێکی کوردی هوشیار بە بارو ژیانی میللەتەکەی دەستی ناچێتە ئەم بەراوردە ، نازانم چۆن ئیتماتۆفو گۆرگیو دۆستۆیفسکیو جاك‌لەندەنو ئەمادۆ کە سـەر بە جیهانێکی گەورەو میللەتانی تێگەیشتوو پێگەیشتوون بە نووسەرانی کورد بەراورد ئەکرێن ! ئەمە لەکاتێکا کە بـەرهەمەکانی ئەوان کە نووسەری وتارەکە کردوونیەتە بەڵگە هەموو ڕۆمانو مەودای ڕۆمانیش ئەمەندە زۆرە جێگای چەندان پاڵەوانی سەلبیو ئیجابیی تیـا ئەبێتەوە • نموونەکەی لای خـۆیشـمان ئەو کورتـە چیرۆکانەن کـە ساتەوەختینو لە چەند لاپەڕەیەکی کـەم دەرناچنو بـە دوو پاڵـەوانی سەرەکی خەفە ئەبن • تەنانەت نووسەری وتارەکە لەوەیش غافڵە کەوا هەر لەو ڕۆمانانەدا کە ئەو پاڵەوانەکانی کردۆتە نموونەی ئیجـابی ئـەمەندە پاڵەوانی سەرسەختو بێئابڕوو پیاوکوژو قامچیبەدەسـت هەن ڕەنگـە

ڕەخنەگر بۆیچووە ـ هەموو جوامێرو قارەمـان نین ، جیهانیشـ ئـەو بەهەشتە بەرینە نی‌یە کە هەندێك تێی گەیشـتون ، گـۆرکی دەڵێت :
« ئەگەرچی ئێمە دیمەنە جوانەکانی ژیان ئەخەینەڕوو ، بەڵام هەرگیز پشت لە دیمەنە ناشیرینەکانی ناکەین » • مرۆڤەکانی ئەم ژیانە هەمـــوو پیاوچاكو ئازاو دەستپاك نینو هەرئەمانەیش نابنە پاڵەوانی چیـرۆك ، مرۆڤە نابووتو بێتواناو دزێوەکانیشـ کوڕی ئەم ژیانـەن ، ئـافرەتی نەزۆكو کەنەفتو کچە ناشیرینو کوڕە تووڕدراوەکانیش دەبنە پاڵەوانی چیرۆك • چیرۆکنووس باسی سێکسیشـ دەکات چونکـە پەیوەسـتە بە ژیانەوە ، هەروەك ئەو شـۆڕشگێڕو پاڵەوانانەیش دەبنە میوانی کـە گیان لەسەر دەستنو خۆشـەویسـتی خاكو نەتـەوەیان لەسـەروو هەمـوو شتێکەوەیە • چونکە ژیان فرەلایەنەو ناتوانین بیخەینە چوارچێوەی تاقە پاڵەوانێکەوە ، هیچ پاڵەوانی چیرۆکێك نابێتە نوێنـەری هەمـوو واقیعـی سەردەمەکەی کەچی هەندێك لە ڕەخنەگرانی لای ئێمە لەناو دەیــان پاڵەوانو چیرۆکی هەرەسەرکەوتوو چەندان کۆمەڵە چیرۆکدا یەك دوو پاڵەوانو چیرۆك هەڵدەبژێرنو دەڵێن خەڵکینە ئەمەیە ئەدەبی باوی ئـەم سەردەمەمان • بێگومان ئەمە ئەگەر بەڵگەیەکی تەواو بێت لەسەردەست بە پاکی نەبردنی هەندێك ڕەخنەگر بۆ بەرهەمی ئەدەبی ، بەڵگەیەکی تریشە بۆ ئەو چاووڕاوەی هەندێك لەمانە بەکاری‌دێننو حەقیقەتەکانی مێژووی ئەدەبیمانی پێ دەشێوێنن •

کورتە چیرۆك :

# چیرۆکی ئاســیاوێك

عەبدوڵلا سەڕاج

تابلۆی یەکەم :

پشتێنە شاڵەکەی بستێك زیاتری لەنـاو قەدی گـرتبوو ، شاڵێـکی تەختەڕەشی ؛ گوڵسەوزی ؛ نیتـك • تەزبیحـە نەرجیلـەکەی باوکی بەدەستییەوە بوو ، خۆی وتەنی ؛ کە باس لە تەزبیح بکرابایە ؛ ئەوەی دووپـات دەکردەوە کـە گوایە باوکـی ڕەحمەتـیی بـە کاوڕێك لـە فەرمانبەرێکی گەورە دەستیکەوتبوو •

دەستی خستە نێـوان پشتێنو سـتارخانییە فاسـۆنەکەی ، ئـەو دەستەکەی تری کردە چەترۆکەیەك بۆ چاوە شینە بزەکانی • ڕوانییە مەرەزەی داوێن زێیەکە • شەماڵێـکی ناکاوی ، گیانی خستە بەر گەڵاو لاسکەکان ، هەر لە چەشنی شەپۆڵ سەرانسەری مەرەزەکە کەروێشکەی کرد • مستەفا ئاغای « کانی هەنجیر » پاژنەی لـە زەوی تـونـدکردو نەڕاندییە سەر خولەی ئاودێرو سەلەی ئاشـەوان ، کە ئەودەمـە وەکـو جووتێ تاژیی پیر لەو گوزەرەدا مڵوموشیان بوو •

ـ : ئەو پارەیەی وەریدەگریت یاخوا بە زەقنەبووتت دەبوو • تۆش سالە بە زەهری مارت دەبوو • قورمساغانە • • دیارە لە گوێی گادا خەوتبوون کە ئاوی کارێزەکەیان بۆ لای خۆیان دابڕی ! دیارە ئەوسا دەستت لە مل فاتە دەرلنگ ریخاویی ژنتا بوو •• ها ••

ـ : قوربان ••

خولە دەرفەتی ئاخاوتنی بۆ نەبوو •

ـ : هەی سفڵەی بێفەڕ ، نەك گۆشتی شانی خۆت ، بگرە هیی باوکیشت لە خێرو بێری منو باوو باپیرانمە ، کەچی وا خوێریو ناکەس بەچە دەرچووی ! باشە سالەی سەرسەگ ئەی تۆ بۆ وا ئاسیاوەکەت بە تالان دا !!

ـ : قوربان ••

مستێ قوڕی بە دەم سالەشدا دا :

ـ : فڵتەفڵت • دەڵێی بەڵمە برنجتان لە دەمە • تەریق نابنەوە • دیارە ، لە قوربان بترازێ هیچیترتان لەبارا نەماوە ! هەی هەر دووکتانم دەکردە قوربانی قولەپای حەمەشین کە رۆژی نیوەڕۆ ، ئەو سەگو سوالانەی بەر شەقو قونداخە تفەنگ دەدا • دە وەرە ئێستا ئێوەی لەبرسانا مردوو ؟ جێگای ئەو بگرنەوە !

ئەمجارە بە جووتەو بە دەنگی لەرزۆکەوە نۆرەبڕییان لە ئاغای غەزریویان کرد :

ـ : قوربان دەتۆ •••

ـ : دەمتان سواخ نەدەن ، پاژنەی ئەم پێڵاوانەم لە دەمتان دەپەستم • هەی لە ژن کەمترانە • کوڕە ؛ ئەم ڕەشوڕووتە دایك واو وا لێکراوانە ، کەی بە قسەی خۆش هاتوونەتە ژێر بار • هەی خولەی دەویت •• هەی سالەی تەرەس ، منێك وا سووك بم ، بە مچە لووتبەران ، لێرەو لەوێ تانەو تەشەرم تێبگرن ! قەیناکات ، با لە بەرانیش کەمتر بم ئەگەر مێخسکەیانم لەبێخەوە هەڵنەکێشا •

هەناسەی سوار بوو • بە چاوە سەگلاوییەکانی ، هەڵیڕووانییە ناو دێو دەستێکی بۆ مشکیو جامەدانییە چویتکراوەکەی برد ، نەبادا لەو هەڵچوونەیدا ، لە یەکتر ترازابن • سالەو خولەیش لە شێوەی کلکەگا خێرا خێرا ، بەپشتیەوە دەلەقانەوە ! مستەفا ئاغا دگانی جیڕکردەوە •

ـ : ئەم گەڕو گولە هەنگڵ بۆگەنانە ، هەر دەبێ بە دژوێنو تفو نەقیزە لێیان خوریت ، ئەگینا ••

هەتا ماوەیەکیش ، پاشماوەی جنێوو هەڕەشە بەڕوویەوە دیاربوو•

**وردبوونەوە لەگەل خۆما**

بەسەرهاتی پێشوو ، چیایەکی قورقوشمینە وا لە هەستو نەستمدا ، بەڵکو لە هەستو نەستی زۆر کەسدان • مرۆ نییە رابردووی نەبێ ، ئەگەر نا ، دیارە ئەو کەسە دەمێکە مردووە • من کە رێبوارم

پێدەڵێن ، ئێستاکە دەمەوێ بیر بکەمەوە ، بەڵام بۆشاییەك لە ژوورەوەمدا، وەکو تووتنێکی هــەزار بەهــەزار ، قورقــوڕاگەی ئــەو بیرەوەریانــەم دەگرێت و دەیەوێ بیتاسێنێ • هەستم دەبێتە هەستی نامۆیەکی نابەڵەدی ماندووی دەشتەلاَنێك •

وا مێشــك دەگوشم و جڵەوی هۆشم دەسگیر دەبێ ، بــەڵام بیر لە چی بکەمەوە ؟ هەرخــۆم وەڵامی پــرسیارە بێدەنــگەکەی خۆم دەدەمەوە : بیر لە هەرچی دەکەیتەوە ، بــکەرەوە بەمــەرجێك بــۆت ڕاوبکرێت لەو چیــا قورقۆشمینــەی رابــردووت ، بۆئــەوەی ئێستات هەڵسەنگێنیو داهاتووت بەدی بکەیت • هەڵوەستێك دەکەم • ئەوســـا یەکسەر ڕوو لە ناوەوەی خۆم دەکەم • شۆڕ دەبمەوە • شوڕ دەبمەوە ، بەو ئاواتەی کە چنگ لە ڕەگو ڕیشەکان بگرم و بگەمە هۆو ئەنجام و ... ناخی شتەکان •

**تابلۆی دووەم**

سالەی ئاشەوان لە مستەفا ئاغا چووە پێش :

ــ : دە دوانزە کەڵەپیاو هاتن و ئاسیاویان ئاشبگیر کرد ، ئیتــر منێکی پەککەفتەی بەساڵاچوو چیم پێدەکرا •

خولەی ئاودێر چاوێکی لاسەنگی لە دەم ساله بڕیبوو ، ئەو چاوە کزەکەی تری لەبەر تیشکی خۆر چوقاندبوو ، بەڵام کە هەلی بۆ هات ، بوژایەوەو وێرای دەم بکاتەوە :

ـــ ئاغام دیارە هەر ئەوانیش بوونــە کە ئــاوی کارێزەکــەیان شــکاندووە ، ئەگینا کێی تر دەســتدرێژیی بــەرفراوانیی وا دەکات •!!

— ئیتر •

مستەفا ئاغا ، بەو وشەیە قارو کەفو کوڵی دڵــی دەرپەڕانــد • چاوێکی سووری کەمتەرخەمی هەڵدایە ناو گوند ، هەروەکو لە جامــی جەمەوە بڕوانێت ، کەس بە کەسو بێبەپێی دی • بــەڵام لە مێشــکیا کەتنو نەخشەیەکی بۆ تاوتۆ دەکردن •

— باوکم خوا عافووی کات چاك ، زۆر چــاك ، لە زمانــی ئەمانەی دەزانی • سالە خــۆ کەســـــ نەزانێ ، تو چاك لــەوە ئاگاداری کە بــاوکی ڕەحمــەتیم چــۆن لــەژێــر کۆشکەکەی دەیپەســــتاندنو بە فەلاقــە جــەزرەبەیــانی دەدا • ئاخ ، لەمبارەدا دەستم بڕاوەتەوە •

* * *

دیوارێکی وشکەکەڵەکم لێوە دیارە • گلێنەی هەردوو چاووم لــە بەردێکی ڕەشداگیراوی ئەو دیوارە توند دەکەم • چاو ناتروکــێنم • دەمەوێ لە ڕابردوودا بم • پێش چاوم لێڵ دەبێ •

ئاگاشم لە خۆم دەبڕێو دوایی کەمە کەمە ، هێدی هێدی هێڵەکان ڕوونتر دەبنەوە • دەرگای مزگەوتی دێیەکە بە چاکی دەناسمەوە • سێ ریز بزماری زل • تەختــەکەشی سەوز بۆیــە کرابــوو ، ئــەی چۆن نایناسمەوە !؟ ئــەو دارەی پێــش دەرگاکــە ، حەشــارگەی چــەندین نهێنییە ، خۆ بە دوو زەلامی چوارپەل قــەوی ناوقەدیــان بــۆ ناهاتــە باوەش ، بۆیە هەڵــگری مێژوویــەك بــوو لــە کێشــەو هایتوهووتو بەربەرەکانێی ئەو دێیە • ئەمیش ئاسیاوەکەی خــوار ئاوایــە کە لەبەر شانۆی چاوما ئاوی لێ بڕاوە • ئەمیش کۆشکەکەی مستەفا ئاغایە •

ئەوانەیش کونجە گڵینە داڕووخاوەکانن ، بەڵام بۆ ئاسمان وا ڕەش دەکاتەوە ! هەر وەکو گشت قەلەرەشی گیتی ئاسمانی « کانی هەنجیر »یان گرتبێ ! ئێستاکانێ بەتەواوی لە ئێستام دابڕاووم و مەلی هۆشم بەرەو بیست ساڵی پێشووم هەڵفڕیوە ، وا لە کاتێکی‌تردا خۆم دەبینم ، لە جێگایەکی دیکەدا چاو دەکەمەوە ! واقم وڕدەمێنێ • سەرسام دەبم • ئەوە منم لەگەڵ دوو کەسی‌تردا ڕوو لە مزگەوت دەکەین • خەڵکی گوند کە ئێمە دەبینن لەخۆشیانا چاویان دەبریسکێتەوە ، مستەفا ئاغاش زۆر کۆشش دەکات بۆئەوەی دامان‌بڕێت‌و بچینە دیوەخانەکەی ، ئێمەیش بۆئەوەی بێلایەنیی خۆمان بچەسپێنین ؛ هیچ ماڵێکمان پەسند نەکرد لە مزگەوت بەولاوە •

وا سەرنجی ڕێگاکە دەدەم • دایکێك ساواکەی بەسنگەوەیە • ساواکە دەداتە پرمەی گریان ، دایکی چەند جارێك لێی دەخوڕێت‌و دواجار ؛ بە لەپی دەست دەمە بچکۆلانەکەی دادەپۆشێ • ساواکە بە زای سامانی کوڕم دەبوو • ڕووی بە ڕووناکی شۆردرابوو ، چەند جارێك هەنسکی بەرەو خوار دەچێ‌و پاشان کپ دەبێت • من هەست بە دڵگرانییەك دەکەم • مانگایەك پەراسووی بەدەرەوەیە ، بە کلك ڕاوەشاندن خۆی لە مێش‌و مەگەز پاس‌دەکات‌و جاروباریش ئاوڕ لەو حەشاماتە دەدات ••

باڕەی مەڕو بزن ••• کۆزێك بە تەیمان تەنراوە ••• دار هەنجیرێك ••• کیژۆڵەیەکی باریکەلەی چاو مامزی لەچەك زەرد ، بەلەنجەوە تێپەڕ دەکات بەرەو کانیاوی ژنان ، پامووروەکەی سەرنجم ڕادەکێشێ ••• ئەمیش تەنوورێکی نزم • • لاکەون • • لاکەون • • باع •• باع •• ڕێ بۆ مامۆستاکان چۆڵ کەن •• کەڵەکەی شیاکەی

وشکەوەکراو •• گار •• گار •• فەرموون •• فەرموون ••
قوو ققوو قووووو •• واق •• واق • فەرموون •• فەرموون ••
هەپشم •• هەپشم •• دەی مام ئەحمەد سەبری هێنا ، ئینشاڵلا ساڵەکەی
خۆش دەبێ •• حەپ •• حەپ •• مر •• مر •• مر ••• چغـه
بـەولاوە •• مامۆستاکان فەرمـوون •• لاکـەون •• منداڵێـك تـازە
خەتی‌داوە ، دووزەلەیەکی بەدەستەوەیە ••• برێ باڕۆکەی هەمەڕەنگ
چینە دەکەن • دایکانە چین‌چینەکەیان خۆڵەمێشی زبڵدانەکە بەسەر خۆیا
دەکات • بەخێر بێن •• یاخوا بەخێر بێن •• دوو کابرای شان‌خوار واز
لە سێ‌ریزکانەکەیان دێنن •• لاکەون •• یاخوا پـاو قەدەمتان خـێر
دەبوو •• ریش‌سـپی‌و مـەلای دێ بەدووامانـەوە بـوون • دەرگای
مزگەوت والا بوو • لە ناوەندەوە قـەیاسی ئەژنۆیـەك ، سـەکۆیەکی
قـوڕین بڵند کرابووەوە بۆ نوێژی ئێـوارانو تـەراویحی رەمەزانان •
باگردێنێکی دارین لە خوار سەکۆکەوە سەرنجی حەشاماتەکەی دەدا •
یەکێك ئانیشکی دایە باگردێنەکە ، یەکسەر ناسیمەوە کە برزۆیە بەوەی
کە چاوەکانی رەش‌بوون وەك قلەترێ‌و دەجوولانەوە وەکو هەڵماتـی
جیوە •

برزۆ لەکاتی درەودا ، گشت ساڵێك ئەو مەڵبەندو ناوچانـەی
هەردوو دیوی زێی تەی‌دەکرد ، بۆ تیژکردنی کـێردو چەقـۆو داسی
خەڵکی ، پاش تێژکردن چـاك لە هەستـانی دەدان ، قۆناخـە تفەنـگی
شکاوی بزمارریژ دەکرد •

رایەخ‌و لبادو بەڕە بان‌سەکۆکەیان نەخشاند • سەرتۆپێ ئاوایـی
هاتبـوون ، قوژبن نـەبـوو لـە مزگەوتەکە نەبووبێتە تەتەڵەمیرانێك بۆ
خۆی • دەسـتمان کردە لێکۆڵینـەوەو شایەت بانگ‌کـردن • بۆمـان

ساغ بووەوە ؛ هەروەکو حاجی رەشید ناوێك و دوو سێ ریش چەرموو دانیان پێدا نا ؛ کە ئاسیاوەکە لە باوو باپیرەوە بەدەست سۆفی مارف ناوێکەوە بووە ، ئەویش لەبەر ئۆجاغ کوێری و بە شایەتی مەلای دێ و چەند ئاین پەروەرێك ، ئاسیاوەکەی کردووە بە وەقفی مزگەوت • ئیتر لەوەودووا دەچێتە سەفەربەلك و ناگەڕێتەوە ، حەمەمین ئاغای باوکی مستەفائاغا تومەز ئەودەمە ، چاوی دەپەڕێتە تەوقی سەری و بە سەد بەندو باوو پۆلەتیقە ، دەس بەسەر ئاسیاوەکەدا دەگرێ و مفت بۆ خۆی زەوتی دەکات •

کێشەکە بەلامانەوە ئەوتۆ بوو کە لە بارو دوخی وا پەلەدا ، بە سانایی و گورج بەلایەکدا نەشکێتەوە ، بۆیە وەکو چارکردنێکی کاتی ، بڕیارماندا کە ئاوی کارێزەکە ، تاقەوتاق برابەش بێ لەنێوان خەلکی دێ ؛ مستەفائاغاش وەك ئەوان ، چونکە نەیتوانی قەوالەی خۆی نیشان بدات، لەکاتێکدا جووتیاران مافی خۆیان چەسپاند بەوەی کە ئارەقی رەش و مۆریان دەرداوە لە کاتی بێگارو کارێزکەندن و کۆزماڵ و جۆگا هەڵبەستندا • بەڵام لەمەڕ ئاسیاوەکە ، بڕیاروابوو کە ئاوایی بێ جیاوازی باراشیان بە مزەیەکی کەم بهاڕن و مزە ئاشی گوندە نزیکەکانیش چوون یەك بێت لەنێوان مزگەوت و دانیشتوواندا • بڕیارەکانمان پەنجەمۆر کردو مشتومڕی خەلکی و خێمەی ئاغامان جێهێشت •

**ورد کردنەوەو گەڕانەوە**

ئەم ماتییەی پێش چاوم چییە ؟ ! بشێ شەماڵ وازی لە دەسبازیی زەل و ترشۆکەو گەڵا تازە رسکاوەکان هێنا بێت ؟ ! یان خوڕەی ئاوی قەڵبەزەکان تاسابن ! ! ئەی زەوی ! دەبێ ئەویش لە خولانەوەی خۆی یاخی بووبێت ؟

هەست بەوە دەکەم کە وەك ئەوەی بێ بەنج کێردێك لە لەشمدا گێرە بکات ، یان وەك ئەوەی زامێکی زۆر چاڵ لە سنگمەوە بکرێتەوە • تەکان دەدەم • هەنگاوێك دەنێم •• هەنگاوێکی تر •• دەوەستم •• هەنگاوێکی ترو بەرێك بەلاوە دەکەمەوە • گوێم لە ترپەی دڵمە • ئەمجا ڕاستو چەپ ، کوچەو کۆڵانەکانی دێیەکە دەپشکنم • گیاندارێك نابینم• زمانم پارچەیەك تەختەیەو نابزوێ• خانووبەرەکان خۆڵەمێشین • ئەمیش کەلاکی وڵاخێکی بەرزەیە • ئەویش تەیمانو چیلەکان بەسەریەکا هەڵشێلدراوون• بە خۆم دەڵێم ئەم دیمەنە بە مەندیی ژنێکی سك پڕی ژانگرتوو دەکات ! خۆ جۆگا ئاوەکان وشكو برینگن ، قەوزە کەنار بەردو چەوەکانی هەڵگەڕاندۆتە سەوزێکی مردو • ئەوەتا مەزراو کارێزو قامیشەڵانەکە ، کە پێشتر مرۆ لەبەر قیرەی بۆق کاسو هەراسان دەبوو، وەك ئەوەی خۆڵی مردوویان بەسەرا کرابێت وایە ! ئەی ئاسەواری ئاسیاوە ئاو لێبڕاوەکە ! هەر مەڵێ • ئا پاشی بڕیارەکان ، هەفتەیەکی نەخایاند تەتەر هاواری ڕاگەیاند کە ئاشووبەکە سەری هەڵداوەتەوە • ڕایانگەیاند کە هەندێك ، لەژێر باڵدمی تاریکیدا چنگ لەسەرشان هەڵیانکوتاوەتە سەر ماڵی برزۆی دەمڕاستی دێو گوللە بارانیان کردووە • تۆفەی پیاوی ئاغا بریندار بووەو کوڕی ئاغاش دەستی لە جێ چووە • ئیتر سەرو قۆڵو شان شکاو ، لە هەردوو بەرەدا ، زۆرن •

بێسێودوو ، مستەفا ئاغامان سەر بە گۆڵمەزو گۆبەندەکە زانی • بڕیاردرا کە ئامادە بێت بۆ لێپرسینەوەی چورتمو گاشەکە • خۆ لەڕاستیدا بڕیاری پێشوو هەتوانی برینەکە نەبوو چونکە دەبوایە مستەفا ئاغا زوو قەمتەر بکرایە ، بەڵام ئەوسا وای دەویست ، ئەوەشی بخرێتە پاڵ کە مستەفا ئاغا کەپرێکی لە سەرووی کانی ژنانەوە قوت کردبووەوە گوایە لەوێ مێشوولە کەمترەو بە نیوەڕۆیان سەرخەوێکی لێ دەشکێنێ •

چاو دەکەمەوە • چاو دەپروێنم • شتەکان لە تاقگەیەکی رووناکیدا مەلەدەکەن • نە دێ دەبینم ؛ نە ئاغاو خەڵکی دێ ، تەنیا هامشۆکەران نەبێ کە بە پرتاو بە هەر سووچو لایەکدا شاندەکوتن وەك ئەوەی لە پێشبرکێدا بن بۆ دەسگیرکردنی گرۆڵەی داهاتوویان ! منیش کە رێبوارم ناوە ئەو گرۆڵەیە بە ماسییەکی لووسی ڕەنگاوڕەنگ دەچوێنم کە هەزاران دەست پەلاماری گرتنی دەدەن ، بۆیە •••• ڕوو لە خۆم دەکەمەوە ، شۆڕ دەبمەوە بەرەو ناخی خۆمو بە کەسێکی نادیار دەڵێم :

ـ دەی ، گیاوگژ لە پەیین و خوڵەمێشەوە دەڕوین •

**تەمووزی ١٩٨١**

---

شاعیران نامرن ••
کە ئاواش ئەبن ،
وەك ئەستێرە وان
لە تاریکیدا تیشکیان دیارئەدا ••

**میخالسکی**

---

# دڵی بەر بایەکی نامۆ

جەلال مەحموود عەلی

« پێشکەشە بە برا ئاوارەکانی ئەودیومان »

## - ١ -

خانەخوێکە دڵخورد ، سەرجەنجاڵ لە تاریکیدا بۆ رۆژ دەگەڕا ، لەبەر خۆیەوە دەیوت : « بەمشەوەو لە هەر چوار لاوە ، ئەم هەموو میوانە !؟ لای هانایش بڕابێت ! ماڵیش کوتەماڵو دوو بست !؟ » •

ئەستێرەکان چاوبرکێیان بوو • سەری هەڵبڕی •

« رۆشنایی ئەمشەویان لە هی جارانیان دەبێت زۆرتر بێت، نووتەکیی بێچراو کارەباییمان لە دڵ دەرکەن » •

میوانێك دوور لە خانەخوێکەی لەگەڵ میوانێکی تری تەنیشتی چرپەی بوو :

— کەی بگەڕێینەوە ؟

— پیاو نە هاتن بەدەست خۆیەتیو نە ڕۆیشتنیش •• بەڵام خانەخوێ کەس بێت باشترە ، پیاو پێیدا ڕادەپەرموێت •

— میوانی درێژخایەنیش شتێکی خۆش نی‌یە •

— تا رۆژ نەبێتەوە رۆیشتنەوە کارێکی ستەمە •

— ئامۆزاکان چۆنن ؟

— دڵیان داونەتە بەر بایەکی نامۆ گوایا بەوە دەردەدڵەکەیان لە کۆڵ دەکەوێتو ئاسوودەیش •••

هاورێکەی پێکەنی :

— ژانەدڵ دەرمانی تایبەتیی خۆی هەیە •

- ٢ -

دوو دایکی میوان سرپەسرپیان بوو یەکێکیان دەیوت :

— دڵم تەنگە • تازە لە دێکەماندا کوڕێکم ناشتووە • حەزمە دوو دڵۆپ فرمێسك لەسەر گۆڕەکەی هەڵڕێژم • پێم‌دەڵێن لێرە میوانیت • حەزدەکەن گـوڕی مردووەکانیشتان بـۆ دەگوێزینـەوە با لـە بەرچاوتان بن • ئێمە وا دڵتان خۆش‌دەکەین •

شێلاوگەی فرمێسکی دایك دەلیایەکی پێك‌هێنا ، تاقمێك میوان بە سواری کەشتی‌یەك بۆ شوێنەواری دێ گـەڕانەوە • گـۆڕستانەکە ڕاست بووبووەوە بە رووتی شەڕەشیریان بوو ، گرمەی مردووەکانو زریکەی تەرمە ڕەشەکان دەگەیشتە کەشـکەلانی فەلـەك • فریشتەیەك چرپاندی بەگوێیاندا : « ئەوەتی میوانن هەموو شەوێك تا بەرەبەیان لەم نشیوانەدا ئەم جەنگە گەرمە لەئارادایە • تا ئێوەش میوان بن ئەمزۆرانـە هەر دەبێت • دەڵێن ئەمە نیشانەی گۆڕانی شیرازەی گەردوونە ئـیتر

ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسماندا لەنگەر دەگرێت ، ئەوسا ئەم ئەرکەش لەسەر مردووەکان هەڵدەگیرێت‌و سوپای تارماییش تەفروتووتا دەبێ » •

## - ٣ -

خاتەخوێکە چاکی مەردانەی لێ بەلادا کردبوو ، بەڵام ئارام بڕاوو هەناسە توند • ئەشکەنجەی هەموانی هەڵدەمژی‌و تاڵاوی دەدایەوە ، دانیشتوانی کتێبەکەی دوێشەوی لە گۆڕەپانی مێشکیدا کۆڕیان بەست• گشت ئاشناو هاوڕێی کاروان ، شەنەکەوی ڕۆژگاریان دەکرد • گوڵیان دەچنی‌و چقڵی ژیانیان بژارە دەکـرد • جەزائیری‌یـەکە هەڵی‌دایـە : ئێمەیش هەموو سۆڵەی میوانیمان نۆشیوە ••• کێ ئەوەندەی من گلێنەی بە دەرگای ماڵەکەیانەوە رووەوە ؟

کووبایی‌یەکە ، بۆی تەواوکرد : « هەمووکارێك باری راستیی خۆی وەردەگرێت ئەگەر کەمتەرخەمی ڕێی پێ نەگرێت » •

ڤیەتنامی‌یەکە پێکەنی : « ئێمە نەبووینە میوان ، لە ناخی زەویدا خـۆمان رووانـدو لەوێـوە نێزەمـان لە قەبرغـەی یانکـی گیرکـرد ، تا کوناودەر بوو ، ئەوسا لە دەرەوە لاشەکەیمان کرد بە نێزەوە تـــا ڕۆژی کچی سروشت پێی پێ‌بکەنێت » •

پۆلەندەیی‌یەکەش وتی « ئێمەیش لە زێرابەکاندا خۆمان ناشـت‌و دەستمان کردە ملی هەمـوو دۆسـتی گـێتی ، ئەوسـا بـەری ڕۆژمان پاك کردەوەو بە یەك شادبووینەوە » •

یوگۆسلاڤیایی‌یەکە قنسەکەی لە دەم قۆستەوە : « بەڵام ئێمە هەموو میوان بووین‌و هەموویش خانەخوێ ، لەبەرئـەوە گـورگە رەشـەکان

هەناسەیان لەبەر بڕابوو ، نەیاندەناسین کێ خانەخوێیەو کێ میوان ، جیهان چەرمی چۆلەکە بوو ، زوو تێیدا پووکانەوە » .

قولەڕەشەکانیش باوەشیان بەیەکدا کردبوو ، دڵیان دەستی گرتبوو تەقەی تەپڵی هەناویان ئاشکرا دەبیسترا . وادیاربوو هەواڵی گەڕانەوەیان بیستبوو .

فەلەستینییەکیش کز لەولاوە هەڵتروشکابوو ، ژان دەمی چوانبوە کلیلەو لە دەروونەدا دەکوڵا . داخی دەچووەوە : « سەدئەوەندە میوان بم ڕۆژم هەر لێ دەبێتەوە . خەیاڵیان خاوە خوێنی من شادەلیای ئەتڵەسی دەمەیەنێت » .

لەناکاو پیرێکی ئیفتادە لە ئەسپە سپییەکەی دابەزی ، تارمایی فریشتەیەك بوو ، هاتە ناوەراستی کۆڕەکەوە ، باوەشی بە هەموویاندا کرد « ئۆخەی دۆستە دێرینەکانم دەبێت بمناسن ؟ ئەوەی بۆ هۆلاکۆو جەنگیزخان‌و تەیموری لەنگ‌و گەلێکیتری وەك ئەوان سوێی میوانی نۆشیبێت‌و ڕیشەی گوڵاڵەسوورەی لەسەر دڵی پەروەردەکردبێت بەتەنگ میوانبوونێکی چەندکاتەوە نایەت » .

ئاوڕێکی لە خانەخوێکە دایەوە وتی « من باپیرە گەورەی میوانەکانی تۆم . مژدەیان بدەرێ کە میوانی هەر میوانییەو هیچیتر » .

# گەشــتی دڵ بۆ ناخی ژیــان

**ئیسماعیل زینۆیی**

هەموو شەوێ ، ئەفڕم .. ئەفڕم
ئەفڕم بــۆ دوور
بەدوای خونچە گوڵی نارنجیو مۆرو ئاڵ
زەردو سوورو سپیو شینا
باڵئەگرم
هەموو خۆشەویستەکانت
بێ ماڵئاوایی ڕۆیشتن
لەنێو دەماری برینــا
منیش ئەڕۆم
بە هەمان نیشانەو ڕێگا
بەرەو قووچەڵانو عاسێو
کەنداڵو چۆم
بۆ دڵداری
لە بەهاری داهاتوودا

ئاهەنگێك بۆ منداڵەكان
ئەگێڕم ... ئەیكەم بە دیاری

* * *

لەگەڵ پاشماوەی خەونەكان
بۆ ئەوبەری سنوورەكان
شەپۆلی تەمەن ئەمڕوێنێ
چەپكە گوڵێكم چنیوە
شادی دێنێ
وشەی پرسیار لەسەر لێوە
لەپێتەختەكان ئەپرسێ
دەیەوێ ئیمڕۆو دوێنێكە
لە یەك پێتەختا بناسێ
هەتا گریانو پێكەنین
دەست لە مل كەن
بە دەنگی بەرز گۆرانی
لە گەرووی مرۆڤ بێتەدەر
زەماوەند بێ بۆ خۆشیی ژین
لە گشت شارە ونبووەكانا
سنوور بێتە یەك جەمسەر

چیرۆك

# خۆڵبـارین

## ( پێشکەشە بە قوربانی‌یەکانی دەستی زایۆنیزم )

سەلام مەنمی

### ١ ـ ســـەرەتا

خۆڵبـارینێـکی ناوەخت کەپرۆکەی بەســەر گونـدەکەدا کــردو دایپۆشی •• هەتا ئەهات زیادی‌ئەکردو بەرەو کۆمانجەبەستن ئەچوو •• کون‌و قوژبنی گوندەکەی پڕ کرد ، سەربان‌و دیوارەکان سوور بوون ، سەری درەختەکان قورس بوون‌و لەگەڵ زەوی‌یەکەدا ڕێك‌بوونەوە •• دەست‌نرایە قوڕگی کانیاوەکان •• مرۆڤەکانیش کاس‌بووبوون ، بەرپێی خۆیان نەئەبینی ، بێ‌دەســەڵات‌و ڕووخـاو بـوون ، ئەتـوت کۆتـری باڵ‌شکاون •• هەر سەیری یاساوڵ‌و وێرانکاری‌یان ئەکرد •• دووکەڵ‌و خۆڵ تێکەڵ بە یەکتر بووبوون •• بەری ڕۆژ تەڵخ بوو ، تیشکەکانـی ئاڵوزکان •• گورگ پێشوازیی لە خۆڵبارین کردو بـوو بـە شـوان ، کونەپەپوو مـژدەی وێرانکاریـی هێنـا ، نامـەی ناهەمـەت‌و دوارۆژی گوندەکەی بە دەنگە شوومەکەی خوێندەوە ••

## ٢ ـ کەشتیی تاوان

پسپۆڕێکی ئەم چەرخە پێناسەی بۆ کەشتیی تاوان کردوەو ئەڵێ :

« هەگبەی یاسای ئاڵۆزەو تەوقـە ئەکرێتـە ملی مرۆڤی بێ‌تاوان • دۆستی ڕەشەباو خۆڵە ، دژی ڕووبارو شەماڵو بارانە ، لە هەر جێگەیەك شووت لێ‌دا کوتوپڕ مارو کونەپەپوو ئامادە ئەبن‌و بە چۆکەوە دائەنیشن‌و چاوەڕێی بەجێ‌هێنانی ئەمرن ••• » •

ئەگەر بڵێی ئەو پسپۆڕە لەو پێناسەیە ڕازی نیەو ناتوانێ بەسەریـا زاڵ بێ •• وای‌نیازە لەمەولا لیژنەیـەك کۆبێتـەوەو چەند فەرهەنـگی ڕامیاری بڕەقێننەوەو سوودیان لێ وەرگرن ، بۆئەوەی بتوانن بە هەموویان پێناسەیەك بۆ ئـەو کەشتی‌یە بکەن ، دیسانەوە لەمەیشا گومانی هەیـــەو ئەڵێ لەبەرئەوەی دەقێـك بەرهـەم نایـەت ڕەگەکانـی کەشـتیی تـاوان کۆبـکاتەوە ••• هـەروەك زمان‌ناسـەکان نەیان‌توانیـوەو سەرگەردانن بۆ ئەوەی زاراوەیەکی تێرو تەسەلی بۆ بدۆزنەوەو لە جێگەی ( کەشتیی تاوان ) داینێن •••

بەڵێ کەشتیی تاوان لە ناوەڕاستی شەپۆلی خۆڵبارینا سەری هەڵـدا • یاساوڵەکان دەرگایان کردەوە •• بە کۆمەڵ مرۆڤیـان تـێ فـڕێ‌دا •• شووتێکی لێ‌دا ئەوەی مابوو هەڵی‌لووشی‌و کەوتەڕێ ••

کەشتی ئەوەندەی‌تر دەروونی جەوتین کردن‌و دڵڕەقانە بەسەریەکیا ئەدان‌و کەلەکەی ئەکردن، بە شێوەیەك کەس‌قاچی خۆی نەئەناسی‌یەوە•• مەگەر بتبڕی‌یایە •• ماندوو بوون ، گێژ بوون ، بە قوڵپ ئەڕشانەوە •• ئەلالانەوە ، هەریەکە لای خۆیەوە ئەیوت :

ــــ منداڵەکەم مرد ••

— لەپای چی ••••؟!

— جێگەی باوو باپیرانمان بوو ، لانەیان لێ تێكدایین •• نازانم ئێمە ئاژەڵین یان ئەوان مرۆڤ نین •• لەوبڕوایەدام •• ئەوان گورگن و ئێمەیش ئاژەڵ •••

پــووره ( وەنەوشــ ) لە سووچێــكی كەشتییەكــەوه لــۆژی دابناردبوو ، لەشی نیشتبوه سەر ئارەقێكی ساردی نائاسایی ، دەمارەكانی لە گرێژەنە چووبوون ، قسەكانــی فەرهادی كــوڕی بیركەوتــەوه •• « ئەڵێن تۆفانێك بەڕێوەیە لەباتیی باران خۆڵ ئەبارێ •• وەك ئاتەشــەك مرۆڤ دائەوەشێنێ •• بزن تووشی بەلەباقە ئەكات ، مەڕ مافەتە ئەگرێ ، ڕەشە وڵاخ تەبەق ••• وڵاخی بەرزەیش مەقاو •• ئەوەی نــەتیبستووه ئەیبیستی ، ئەوەیشی بە چاو نەتدیوه ئەیبینی •• »

— جا كوڕم بڵیمچی •• ؟

— بەرانبەری ئەوەستم •• لەگەڵ ئێوه نایەم •• لەمەولایش هەموو شتێكت بۆ ڕوونئەبێتەوه ••

— ئەو تۆفانەی تۆ باسی ئەكەیت كێ هەیە•• بەرانبەری بووەستێ••؟!

— هەر خۆم نیم •• ئەیشیوەستێنین •

— ناڵێی مرۆڤ تووشی ئاتەشەك ئەكات •• ؟ !

— لە سنووری دەستەڵاتی ئەوا نابین ، شەپۆلی زریان نامانگریتەوه ••

سەرۆكی یاساوڵەكان تێیانخوڕی :

— بەگوێرەی یاســای خۆڵباریــن ئەوانــەی نــەماون فڕێ ئەدرێنــە دەرەوه ••

دەستیان بە سنگەوه گرت :

— بەڵێ قوربان •

ــ ئەوانەیش کەشتی کەسیرەی خستوون ••
ــ بەڵێ •• ئەی منداڵەکان •• ؟
ــ یاسای خۆڵبارین وەك یەك سەیریان ئەکات •

مرۆڤەکان ملیان کەچ کردبوو ، هەریەکە لای خۆیەوە ئەیوت ئێستا سەرە ئەگاتە سەرم •• چونکە ئەوانە زۆریان وەك ئێمە زیندوو بوون •• ئێمەیش مردووی زیندوومان پێ ئەڵێن • ئەبێ لەم دنیایەدا کەس هەبێ وەك ئێمە گێژداخ کرابێ ، جەرگی بە تەنوورەوە درابێ ••

کەشتیی تاوان هەڵیڕشتن •• وەك ئاژەڵ مۆڵیان خوارد ، ڕەنگی مردوویان لێ نیشتبوو ، شرو شیتاڵ تێکەڵ بە یەك بوون ، میرزا فەتاح سەیرێکی هاوڕێکانی کردو هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی :ــ ئەگەر یەکێکی نەشارەزا سەیرمان بکات لەوانەیە بڵێ ئەبی ئەمانە پشتیان کردبێتە یاساو عەدالەت بۆیە وا ڕێگەیان بە دڕك چێنراوەو یاسا باری قورس کردوون •

کابرایەك لیستەیەکی بەدەستەوە بوو ، ژمارەی زنجەکانی ئەخوێندەوە •• چەند کەسێکیش دابەشی ئەکردن ، کە چاویان بە زنجەکان کەوت ئەوەندەی تر تەنگەنەفەس بوون ، دەروونیان جەوتین بوو •• میرزا فەتاح دەستی خستە ژێر چەناگەی و لە دڵی خۆیدا وتی : « ئەوە سەیرە پوورت وەنەوش ئەڵێ ئەم وەزعەم وەك ماڵی قاتوقری دێتە بەرچاو •• بەڵام هەرچەندساڵی قاتوقڕی برسێتی هێناو زۆر کەس لەبرسا مردن •• خەڵکەکە کەوتنە گوڵەبڕەو دزی کردنو گۆشتی سەگ و کەر خواردن •• بەڵام کەس بە زۆر خانووی بەسەر کەسا نەڕووخاند ، مرۆڤ وەك جەڵەب نەئەدرایە بەر •• یاسای قاتوقڕی چەند وڵاتێکی زۆری گرتبۆوە ، بەڵام خۆڵبارین چەند ناوچەیەکی دیاری کراو » •

لەملایشەوە پوورە وەنەوش لەناو زنجەکەدا هەلکروشکابوو •• لەناو دەریای خەیاڵدا مەلەی ئەکردو لەگەڵ فەرهـادی کـوڕیدا کەوتبووە قسەکردنو پێی ئەوت :

ــ ڕاستت کرد وتت :ــ تۆفانێك بەڕێوەیە ، لەباتیی بـاران خـۆڵ ئەباری •• وەك ئاتەشەك مرۆڤ دائەوەشێنێ •• ئەوەی نەتدیـوە ئەیبینی ، ئەوەی نەتبیسـتووە ئەیبیستی •• فـەرهاد گیان تـۆ بڵێی ئاواتەکەت بێتەدیو مژدەی چوونەوەمان بداتێ • مـن تـۆ بناسمو شیری دایکی خۆتت خواردبێ بەخـۆڕایی قسـەی وا ناکەیت •• مەردایەتیت لەوەدا بوو ملت کەچ نەکردو لەو تۆفانە یاخیبوویت ••

ــ دایکە دوژمنایەتی گـوڵو منـداڵو پەپوولـە هەتا سـەر ناکرێ ، سەرچاوەی کانیش لە جێگەیەکەوە کوێربێتەوە ، لە لایەکیترەوە سەر هەڵئەداتەوە وەك ئەڵێن بەری خۆر بە بێژنگ ناگیرێ ، ماڵیش لە خاوەنماڵ هەتا سـەر حەرام نابێ • وەك وتـم هەموو شتێـکت لەمەولا بۆ ڕوون ئەبێتەوە •

شریتی بـیری بچـڕا ، سەیریکـرد لە زنجـە ڕووتەکە بـەولاوە هیچی نەدی •••

لەگەڵ خۆی کەوتە گفتوگۆو وتی : ( منیش لەو بڕوایـەدام دوژمنایەتی منداڵو گوڵ هەتاسەر ناکرێ ، چەندەها خۆڵبارانی وامان دیوە بارانی ڕەحمەت شۆریویەتەوەو هەموو ڕێگەیەکی دڕکاوی تەخت بووە •• )

# چوارده قوتابیو نۆ دیاری

« پێشکەشە بە قوتابی‌یەکانی قوتابخانەی جەڕا لە برادۆست »

صەدرەدین خۆشناو

لە دامێن چیاو لەناو دەشتو دۆلی ڕەنگینا ، لەگەڵ سەرەتای بەهارێکی جوانو ڕازاوە •• هەموو ناخۆشی‌یەکانی زستانو پــەژارەی ڕۆژانی ساردو شوماری لەبیربردینەوە •• هەر لەمکاتەی کەژ گۆڕا •• ڕۆژانی قوتابخانەش بەجۆرێکی‌ترا بوو •• لەگەڵ سپیدەی بەیانا •• کــە پرشنگی خۆر هەڵدەهاتو•• گەزەنگی هەتاو لە گوندە خنجیلانەکەی دەدا هەموو گیانلەبەرانیش دەکەوتنە کارکردن ••

چوارده قوتابی لەم گوندە بچـکۆلەیە بـۆ قوتابخانە دەهاتـن •• لەگەڵ هەنگاوەکانی قوتابی‌یان بۆ قوتابخانەو ڕاهاتنی خۆیان لە ژیانـــی ساکارو ئاووهەوا ساردە پڕجۆشەکەو زنجیرە چیای ڕەنگینو سەرچاوەی کانیاو ، ڕووبارە بەردەوامەکە بەناو گوندا ڕەتدەبوو•• گونجانیان لەگەڵ مەڕو بزنو کاریلەو بەرخۆکـەو دەواری هەمەچەشنو ئەسـپی قـولەو جوانکەی ئێسك‌سووكو کۆمەڵەسەگی بەرماڵان ــ دەنگی بێریو شوانیش تێکەڵ بەم دەنگانە دەبوون • • ئەو هەموو ئاوازو دەنگانە تێکەڵ یەکتر دەبوونو سیمفۆنیایەکی سروشتی‌یـان دروسـتدەکرد •• لـەم گونـدە

بچکۆلەش وەك زۆربەی گوندەکانی وڵاتەکەمان •• خانووەکان دابەش بووبوون بۆ گەڕەکی سەروو و خوارو ( ژووروپاو ژێرپا ) •• لەگەڵ فیتەی شووت •• سێ قوتابی لە خانووەکانی خواروو دەهاتن‌و چوار لەنزیك قوتابخانەو حەوتیش لەسەروو بەرەو قوتابخانە دەهاتن • •

— ڕۆژتان باش •

— ژیانت باش مامۆستای بەڕێز !• سەدایەکی نەرم‌و ڕێك لە گوندەکە پەخش‌بوو ••

مامۆستاکەش هەموو ڕۆژێك بابەتی نوێ‌و یاریی هەمە جۆرو وێنەی هەمە چەشنەو دیاریی جوانی فێرکردنی پێش‌کەش بە قوتابی‌یەکانی دەکرد •• بەڵام لەم‌بەهارە جوانە کەوا سروشت وەك گوڵ ڕازاوەبوو •• قوتابی‌یان کۆبوونەوەو •• هەرجارێ یەکێکیان یان دوان بە هاوکاری دیاری‌یان بۆقوتابخانەو بۆ مامۆستا دەهێنا •• دیاری‌یەکانیش لە کولیلکەی ( گوڵی ) ڕەنگاوڕەنگی گوندی ( جەڕا ) بوون ••

بەهار : دەسکێ ( چەپکێ ) گوڵی هێنا لە سێ چەشن بوو •• خەرتەل ، کنێر ، نەفەرەی زەرد • هەرسێکیان ڕەنگیان زەردبوو •• بە چەپڵەڕێزان •• دەسکەگوڵی لێ وەرگیرا •• بۆ بەیانییتر دوو قوتابی بە هاوکاری چەپکە گوڵی خۆیان هێنا ••

حارس‌و ئەسعەد : کوریلکەی بیاز ( سپی ) ، کوریلکەی گۆزەرە ( سپی ) ، کوریلکەی گلیخە •• ئەمانیش بە چەپڵەڕێزان دەسکەگوڵیان لێ وەرگیرا •• ڕۆژی سێ‌یەم قوتابی‌یەکی‌تر •

شەمام : چەپکێك گوڵی هێناو •• بەمە شتێکی نوێی خستە سەر چەپکەکان •• ئەوەیش تێکەڵ‌کردنی ڕەنگەکان بوو •• کوریلکەی

چونگ ( شین )ی لە ناوەوەی چەپکەکەی دانابوو •• لەگەڵ دەورەدانی بە کوریلکەی ستریزەگ (زەرد ) ، کوریلکەی هەڵاڵە ( زەرد ) ، کوریلکەی هەرار ( زەرد ) •• ئەمیش بە چەپڵەڕێزانی گەرمو ئافەرین وەڕێکرا •• ڕۆژی چوارەم قوتابی‌یەکی‌تر •

عەزیز : کوریلکەی ( کەربەشە ) هێنا کە دڕکی هەیەو بە دڕکاوی ناوی دەرکردووە ••

مامۆستا : ئەمە بۆ وا ؟

قوتابی‌یەکان وەڵامیان داوە ، وتیان بەئانقەست ئەمجۆرەی هەڵبژاردووە •

مامۆستا : ئەمە وەکوو خۆیەتی ، بێعارە ، بۆیە کوریلکەی دڕکاویی هەڵبژاردووە • هەرچۆنی بێ چەپڵەیان بۆ لێداو بەڕێکرا ••

شلێرو خونچە : چەپکەگوڵێکی جوانیان هێنا •• کەوا هەر گوڵێکی خۆی لە خۆیدا لە دوو ڕەنگ پێکهاتبوو •• ئۆنجە ( زەردو سوور ) ، حاجیلە ( سپیو زەرد ) ، کوریلکەی شلێر ( سۆرو سپی ) •• ئەمانیش بە چەپڵەڕێزان وەڕێکران •• سلێمانو بەیاس : کوریلکەی پێمریشك ( بنەوشەیی ) ، کوریلکەی ڕەشارۆك ( زەرد ) ، کوریلکەی نوسرەکیان هێنا •• ئەم دوو قوتابی‌یەش بە چەپڵەڕێزانی گەرموگوڕ چەپکێ گوڵیان لێ وەرگیرا ••

بۆ بەیانی‌تر دوو قوتابی بە هاوکاری چەپکەگوڵیان ئامادەکرد • ئەمانەش بەیانو حاجی : کوریلکەی ( سۆسن ) سەوزو بنەوشەیی ، کوریلکەی چویزرەکە ( پەمبەیی ) •• چەپکێ لە سێ ڕەنگی جوان پێکهاتبوو •• ئەو دوانەش وەڕێکران ••

ڕەفیق و جەلال : بەیبوونی ( سۆرو پەمبەیی ) ، چەپکێ لە یەك گوڵ .. گوڵێ لە دوو ڕەنگی نزیك یەك .. چالاکانە هاتنە پێشەوەو .. دیاریی خۆیان هێناو .. بە چەپڵەڕێزان وەڕێ کران ..

دیاریی کۆتایی بە زیختترین ( زیرەکترین ) قوتابی ، دوایی هات . ئەویش یەکەمی قوتابخانە بوو .

جەبار : چەپکە گوڵێکی خستە سەر دیاری یەکان کە جێگای ڕەزامەندیی هەموولایەك بێت .. کوریلکەی سۆراو ( سوور ) ، کوریلکەی گوڵی نیسان و پەقپەقە ( سوور ) .. پێش ئەوەی چەپکەکە بە مامۆستاکەی بدات وتی : زۆر بەدوایدا گەڕام تا ئەم چەپکەم بۆ دەسگیر بوو ..

— بۆ ؟

— پێشان گوڵەکانم دەدیت و دەست نیشانم دەکردن بۆ ئەوەی پاش دەرفەتێك بیان کەمە چەپکێك و دیاری یەکەی خۆمیان پێ بڕازێنمەوە .. بەڵام پاشان بۆم نەدەکرا .. چونکە گیانلەبەران ، ڕەشەوڵاخ و دەوار دەهاتن و لە ناوقەدەوە دەیان پچڕین و دەیان خواردن و بەسەریان دەکەوتن .

— ڕاستە ئەم ئاژەڵانە .. بێ ڕەحمانە بەسەر ئەو نازدارانە دەکەون و .. بەڵام باش بزانن .. ئەم کوریلکانە ڕەگیان هەیە بۆ قوڵایی زەوی چووەتە خوارەوە .. چەند گوڵەکان لەناو بچن .. ئەوەندەی تر دەژێنەوە .. گەر ئەم ساڵیش گوڵ هێز بۆ خۆی پەیدا نەکات ، بۆ ساڵێکی تر گوڵێکی جوانترو ناسکتر لە چەشنی خۆی دەڕوێت و گەشە دەکا ..

بەم‌جۆرە قوتابی‌یەکان کۆتایی‌یان بە دیاری‌یەکانیان هێناو •• بە چەپڵەڕێزان‌و سروود ( جەبار )ی زیرەکیان بەڕێ‌کرد •• مامۆستاکەش هەموو چەپکە گوڵەکانی بە ڕستەیەك وەکردو بە دیواری پۆلەکەیدا هەڵواسی‌و بەم‌شێوەیە پۆلەکە ڕازاوەو •• تا بەهارێکی داهاتوو کۆتایی‌یان بەدیاری هێنا •

**نووسەری کورد :**

ئیمەش لەلاینی خۆمانەوە بڵاوکردنەوەی ئەم پارچە پەخشانە جوانکیلەی مامۆستا صەدرەدین پێشکەش بە خۆی‌و هەموو مامۆستاو قوتابی‌یانی لەمەپێش‌و ئێستاو لەمەپاشی قوتابخانەی ( جەڕا )و هەموو لادێکانی کوردستانی ئازیز دەکەین لەگەڵ جەژنەپیرۆزەی نەورۆزو بەهارو ئاواتی ژیانێکی پڕ لە ئاشتی‌و ئازادی‌و گوڵ‌و خۆشەویستی ••

---

برای مرۆ گوێت لێ‌بێ !
مرۆ بەر لە هەرچی ـ ئەو ڕاستی‌یە
بڵندەیە کە لەو بڵندتر نی‌یە •

**شاندیداس**
ـ سەدەی پازدەهەم ـ

---

# ئـازادی

شیعری : فەدوا تۆقان

وەرگێڕانی : مومتاز حەیدەری

ئازادی‌یەکەم ! ئازادی‌یەکەم ! ئازادی‌یەکەم !
دەنگێکە پڕ بە زاری تووڕەیی
لە بەر بارانی گوللەو گڕدا دەیڵێمەوە
پێ بە کۆتەوەش بم بەدوایەوە هەنگاو دەنێم
هەرچەند شەویش بێ
شوێن پێی هەڵدەگرم
تووڕەیی چەند ئەستوور بێ
قینم زیاتر دەبێ
تێدەکۆشم و داوای ئازادی‌یەکەم دەکەم
ئازادی‌یەکەم ! ئازادی‌یەکەم

★ ★ ★

ڕووباری پیرۆزو پردەکان
ئازادی‌یەکەم دەڵێنەوە

هەردوو بەر ئازادی‌یەکەم دەڵێنەوەو
« با » ی تووڕەی دەربەندەکان‌و
برووسك‌و ڕەشەباو بارانی نیشتمانەکەم
داوای ئازادی‌یەکەم دەکەن

★ ★ ★

من تێدەکۆشم‌و ناوەکەی :
لە زەوی ، لەسەر دیوارو دەرگاکان
لە ڕۆژهەلاتی ماڵەکان
لە پەیکەری مریەم‌و مێرابدا
لە ڕێ‌و بانی کێڵگەکاندا
لە هەموو بەرزایی‌یێکا
لە هەموو نشێوو پیچ‌و شەقامێکا
لە بەندیخانەو زیندانی ئەشکەنجە
لە داری سێدارە
هەڵدەکەنم

★ ★ ★

سەرباری زنجیرو ماڵ‌کاولی
سەرباری هەڵاوی ئاگر
هەر ناوەکەی هەڵدەکەنم
تا دەیبینم
لە نیشتمانەکەمدا پەل‌داوێ‌و گەورە دەبێ
هەر گەورە دەبێ

هەر گەورە دەبێ
تا هەموو بستێکی خاکەکەی دادەپۆشێ
تا دەبێنم
ئازادیی سوور
گشت دەرگایێك دەکاتەوە
شەویش ڕادەکا
ڕووناکی‌یش
ئەستوونی تەم‌و مژ دەڕەوێنێتەوە

* * *

ئازادی‌یەکەم ! ئازادی‌یەکەم !
ڕووباری پیرۆزو پردەکان
ئازادی‌یەکەم دەڵێنەوە
هەردوو بەر ئازادی‌یەکەم دەڵێنەوەو
« با » ی تووڕەی دەربەندەکان‌و
برووسك‌و ڕەشەباو بارانی نیشتمانەکەم
لە گەڵما دەیڵێنەوە :
ئازادی‌یەکەم ، ئازادی‌یەکەم ، ئازادی‌یەکەم •

# پەیکـــەر

ئەحمەد قادر سەعید

که بۆ یەکەم جار چاوت کردەوە ، گەورە بووی • هەستت چرۆی خەڵفێکی دار گوێز بوو ، ئارەزووی کوێستانی دەکرد • پێتوانەبوو جارێك له جاران خۆت له دەمی گورگا دەبینیەوە • باوکت له زووەوە بەنیـازی داستانێك ناوی نابووی ، بۆ زیاد له هەموو ناوێك « دیـاری » • ڕەنـگە ئەوکاتە تۆی بە باڵای دیاری‌یەکی مەزن بڕیبێت • ئا، دەیویست له پێشەنگا هەتوانی چارەی دەردێکی کوشندەی بیت ، گەلێك جاران پیی دەگوتی « ڕۆڵەکەم نەیدۆڕێنی ! » •

وشەی دۆڕاندنت لا سەیر بوو • بە خۆت دەگوت : « بۆ چی‌یـە نەیدۆڕێنم ! » کەچی هەر زوو بەدوای نەدۆڕاندندا وێڵ‌بووی • دەتویست بزانیت ئەو قسەیە سەر بەکوێوە دەنێت • گەورە بووی • دەیان ئەشکەنجە له دەروتندا ڕوان • ئەوەی له هەمووان گرنگتر بوو و بەڕێزەوە بۆت دەڕوانی گرفتی « پەیمان »ی ئامۆزات بوو • زۆر خۆشی‌دەویستی‌و تۆش وەهـا بووی ، بـەڵام دەتـزانی سەرگـەردان دەبێت • نەتـدەویسـت وای‌لێ‌بکەیت • ئەو خۆی نەگرت ، جارێك پێی گوتی :

— ئامۆزا لەوە ناچێ تۆ وەك من بی ! دەنا ڕۆژێکەو ئەمڕۆ دەرفەتم له دەستمەدە ، له هاوسەری خۆتم بێ‌بەش مەکە •

تو حەزت‌دەکرد • باوکیشت کەیفی پێدەهات‌و رازی بوو ، بەڵام تۆ بە هەمان پارسەنگی جاران دەتڕوانی • بۆیە ویستت دڵنیای بکەیت کە دەبێ ئارام بگرێت • پێت گوت :

— ئامۆزا ، بەرلەوەی تێم‌بگەی‌و بزانی خۆشەویستیم لەچ سنوورێکدایە تۆ لە دڵما وەك ترووسکەیەکی ڕۆشن وابووی • تا هاتی گەورەبووی‌و ئێستا لە بارستاییی لەشم گەورەتری• تا من دیاری بم تۆم چرکەیەك لەیادناچیت ، دەبێ بەئارام بی • کەچی ئەو زۆر بـە دڵنیاییی‌یـەوە وەڵامی دایەوە :

— کوڕە ئامۆزا تینی مان‌و نەمانم نی‌یە• دایك‌و بابی ئیمە هی بەقـا نین ، نـەك ڕۆژیـك لەڕۆژان شـتێك بقـەومێ • تـۆش وەڵامت دایـەوە :

— تا من‌و تۆ هەبین کێ دەتوانێ زەفەرمان پێ بەرێت •

تا گەورەتر دەبووی چاکتر دەکەوتیتە گێژاوی ژیانەوە • باشتر لەمەسەلەکان دەگەیشتی • بە هێمنی بۆ مەبەستەکان دەچووی ، ئەگەرچی هەندێ‌جار سەرگەرم دەبووی‌و لە دەروونتا تووڕەیی پەنگی دەخواردەوە، بۆیە هەر سەرزەنشتی کاسەلێس‌و پیاوەبوودەڵەکانت دەکرد ، خەڵکیت هان‌دەدا لە فێڵیان دوورکەونەوەو بە کاری سەرشانی خۆت دەزانـــی‌و دەتویست کەسانی دیکەش وەها بن • دوا ئامۆژگاریی دایکت ئەوەبوو بەر لە مردن‌و لە دنیا دەرچوونی بەدیاریەوە بیت • بەدیاریەوە نەبووی ، بەڵام ئەوەش ئەوە ناگەیەنێت ئامۆژگاری‌یەکەت فەرامۆش کردبێت • خـۆت دەزانی بۆ نەهاتی‌و « پەیمان »یشت ئاوارەی دنیای نائومێدی کرد • دیاربوو پێشبینی ئەوەت کردبوو کە بۆت نالوێت لەگەڵیدا بەسەرببەیت، ئەویش هەمو

کاتێك گلەیی ئەوەی لێ دەکردی‌و دەیگوت : « لە منی ڕانەدەبینی تـــا دواهەناسەم لەتەکیا بم » • ئەویش ڕاستی دەکرد ، لـە تـۆ چاکتر بـۆ مەسەلەکە چووبوو ، خۆی لە ڕیزی پیـاوان دەژمارد • قەت ڕۆژێك بەخەیاڵیدا نەدەهات پشت لە تۆ وەرگێڕێ یان لە تەنگانەدا بەجێت‌بهێڵێت•• مانەوەی ئێستاشی گەواهی ڕاستیی پەیمانیەتی‌و بەنیازی پابەندی تۆ دەژێت• کێ دەڵێت تا سەر وەها دەبێت یان خراپتر نابێ •

★ ★ ★

لە ڕۆژێکی تۆفی زستاندا دەشتەکەت بەکۆڵتدا دا ، سواری پشتی باریکە ڕێگەکە بووی • بە ڕێگای مان‌و نەماندا هاتی • هەر هاتی‌و گوێت بە هیچ کۆسپێك نەدا! • نەتدەویست پەیمان ببیـنی • دەتزانـی دوات دەخات • دواخرای • ئەوانەی چاویان بەدواتا وێڵ‌بوو و بۆت‌دەگەڕان دیتیانی هەر زۆر خێرا چاویان بەستی‌و دەستیان لەدواوە شەتەکدای • کە بەهۆش‌هاتیەوە نەتزانی لەکوێی ، هەموو ڕۆژێ ، بەیانیان کۆمەڵێـك جنێوی سووك دەکرانە خۆراکی سبەینانت• دەیانویست بتکەن بە بەندە• ئابڕووت بەرن‌و بیخەنە دەم ڕەشەباوە • لە خۆت ڕامای • لات سەیـر نەبوو کە چاوەکانت کزبوون • بە ئەستەم باوکی دلاوەرت ناسی‌یەوە • ماچی کردی ، گفتی دایەی پێت لێ نەبڕێ ، کەچی هەر ئەو جارە بوو نەتدیتەوە ، نەشتدەزانی بۆ کەسیش وەڵامی ڕاستی پێ نەدەگوتی کـە لە ڕێگەی سەردانتا بوو بە پێشەنگی گەشتەکەی تۆ • هەر چاوەڕوانی بووی • وات‌دەزانی زویر بووە ، بۆیە بۆت نووسی :

« مامە گیان ، چاوەڕوانتم ، بۆ دیار نیت ؟ لێم زویر بوووی ؟ تاوانم چی‌یە ؟ دەبێ هەر بێی » • کە نـەهات زانیت کار لە کار ترازاوە• کە پێ‌یان‌گوتی لەسەر دڵت بوو بە گرێ‌کوێرەو نەکرایەوە • فرمێسکی

بەکوڵت باراند • گریای •• زۆر گریای • حەزت دەکرد هەموو دنیا بووبا بە سەنگێك‌و بەسەر تۆدا بەربووبایەوە ، بە ناخی زەویدا ڕۆی‌بردبای • خۆت بە تاوانبار زانی کە بوویتە هۆی نەمانی کەسانی‌تریش • هەموو ڕۆژێ ماوەیەکی باش تێبینیی خۆت دەکرد • خەڵکانی‌تری وەك خۆشت فێری ئارامی کردن • لە کێشەیان ڕادەمای • هانت دەدان توانا لەدەست‌نەدەن • کە سەریشت دەکردەوە خەیاڵ دەیهێنایەوە ناو کۆشی بەئارامی پەیمان • گوێت بۆ قسە خۆشەکانی هەڵدەخست • ئارامی‌یەك جەستەی سڕی دەگرتی‌یە خۆ :

« پەیمان گیان ، هۆ گوڵی تەنیا لێم‌مەگرە کە نەمتوانی خواستە تامەزرۆکانت چێژ بکەم • من دەمزانی ڕۆژانی وەهام لە بەردەمن • ئەو ڕێگایەی من پڕ لە هەورازو نشێوە • وەرە قسەم لەگوێ بگرە : فەرامۆشم‌کەو لەبیر خۆتم بەرەوە ، خۆت بۆ دنیایەکی نوێ ئارایشت بدە• ژیان ئەو چرکانەن تێیدا دەژین • کاری چاکە دەمێنێ • ئەوەندەی بۆت کرا خۆشت ویستم • لەپێناوما دەیان دەردەسەری‌و ئەشکەنجەت دی‌و سەدان تانەی ئەم‌و ئەوت لەخۆت‌گرت • دە هەستە دەی پەیمانێکی نوێ پێکەوەبنێین • ببە بە دایك • دایکێکی دڵسۆز ، بە یادی منەوە مەلاشووی منداڵەکانت هەڵدەوەو بزانە چۆنیان باردێنی•• پەروەردەیەکی مەزنیان کە • پەروەردەی دروست بۆ منداڵانی ئێمە لە خواردن‌و پاکژی پێویستترە • دە هەستە ئەو جلە ڕەشانە دانێ ، ئاڵ‌ووالا خۆت برازێنەوە • چەند وەهابێت ئەوەندش من ئاسوودە دەبم ، لێم مەرەنجێ کە نەمتوانی ئەرکەکانی سەرشانم بەرامبەرت جێ‌بەجێ بکەم •• لە ژیانمدا ئاڵۆز بووم ، ئەگەرچی دەمویست لە کۆشی گەرمتا سەری ماندووم بحەسێنمەوەو دنیای ئاسوودەیی‌و یەکسانی ببینم • چارەنووس

تاوانباره • دڵگیر مەبە • بە ئارەزووەکانم نەکەی بە دڵشکاوی بەجێت دەهێڵم • »

ئەوەندە لە جیهانی ئەندیشەکانتا نقوم‌بووی گوێت لە پەیمان بوو کە دەیگوت :

« ئامۆزا : ژیان خۆشە ، منیش حەزم دەکرد وەك هەموو ئافرەتێك ئاسوودە بم •• کەی پەیدا دەبێ ، تا دار پوازی لە خۆی بێ ، هەرگێز دڵی بابان‌وێرانی من وەبەر ناوەستێ • چۆن وەبەر بووەستێ کە دڵی تۆی گەرم نەکردەوە • مەرجەو کردوومە بە شەقامەڕێی بیری تۆدا هەنگاو دەنێم ، یا منیش دەگلێم یا داستانێ ژیانی نوێ تۆمار دەکەم »

لە ژوورێکدای • دەیان ڕۆژە نارانی کات لەکوێیە • شەوە یان ڕۆژە • سەرت ناوەتە هەردوو لەپی دەستەوەو لەنێوان ئەژنۆکانتدا ڕاتگرتووە • کاتی دیاری‌کراو چاوەڕێتە • لە دەروازەی خەیاڵتدا ، لە بەردەمتدا منداڵان گردبوونەوە ، بوون بە پەپولەو کەوتنە باڵەتەپە ، پێدەکەنین ، شایی‌و خەنەبەندانیان بۆ دەگرتی ، حەزت‌دەکرد بیانگری، لەئامێزیان وەرێنی ، ماچیان بکەی ، سەری نەوازشیان بۆ دانەوێنی • دوو دڵۆپ فرمێسك لە چاوانتا زان ، خزانە بەرپێت ، ئارامیان پێ بەخشیت • لە بەردەمتا بە پەنجە نەخشەیەکی پێچاوپێچت دروست‌کرد ، لات سەیر بوو ئەوەندە بەجوانی پێکت هێنا • نەخشەکە گەورە بوو • بوو بە شارو شار بە وڵات • خۆت لەناوەندیا دیتەوە •• تێیدا گەڕای، هەموو دیهات‌و شارەکان گەڕای ، خەڵکەکەت بەئارامی دەهاتنە بەرچاو • هەموویانت خۆش‌دەویستن ، کەسیش نەبوو تۆی خۆش‌نەوێ • خەڵکی

خەریکی کارکردن بوون ، نەخۆشیو نەخوێندەواری ئاسەواریان نەمابوو، وڵات پڕ لە کتێبخانەو خەڵکی سەرگەرمی خوێندنەوە بوون »

پەنجەت هەڵبڕی ، هاتیە ناو چوار دیوارێکی تەنگ • خەمت نەخوارد • ئاسوودە بووی کە بەر لە دوانزە سەعات دوا ماڵئاوایی ئەو چەند وشانەت بۆ باوکت نووسی :

« بابە گیان •• ژیان خۆشە ، بەڵام سەربڵندی لە ژیان خۆشترە • حەزمدەکرد لەو دواکاتانەدا مام نەریمانم بدیایە •• مەگرین •• ماڵئاوا »

هێنرایەوە ، بۆ دواجار خەڵکەکە ماڵئاوایییان لێ کردی ، بەڕێیان کردی ، لە دڵیاندا بووی بە پەیکەر ، لە گۆڕەپانی بڵندی هەستیان دانرای • دەیانیتر بەڕێبازتا هەنگاویان نا •• بوونە پوورە هەنگ شیلەی گوڵی بیرتیان مژی •

# وەشەویسیما جە گەردوونی فراوانتەرا (١)

ئوسـمان هۆرامی

نازدارەکەم ،
دیسان جە نۆ
ئانا دیما قیامەت هۆرست ، (٢)
ئێر کۆتەنۆ ، (٣)
یارشا جە یارا دوورۆ وست ، (٤)
وەرمو چەما تۆریا ، تۆریا ، (٥)
هەسارەو ئەشقو نازارا (٦)
کزو تەنیـا
مدیۆ ئاسۆگاو نەمری (٧)
خونچەو سۆسەن
شەوبۆو جنوورو کەمەری
هەراڵەبردمو یاسەمەن
گۆناو بارەگاو شەیدایا
کڕنووش بەرا ؟
گرد هەناسەو دەربەدەرا (٨)
گێرانە باوەشو گیانی (٩)

پرشنگ مدانه ئاسمانی ، (١٠)
جه بارەگاو گیانی بەرزی
سەرنەوەیۆ (١١)
هەزار گوڵزارو چوار وەرزی
سەر هورمدا ، (١٢)
ڕۆشنی مدا
بە تەختو چەرخو گەردوونی ؛ .....
گردو گیانە نەمرەکا
گزنگ مدا
بە ناخو هەستو دەروونی ؛
ژیوای تازەی ڕۆشن بۆوە (١٣)
پێوانەو گەردوونی جە نۆ
فاڕیۆنە ، دیسان جە نۆوە ؛ (١٤)
ئازیزەکەم ،
ئەی چەمەو گیانی بەختەوەر
جا دووبارە
چەمەو ئەشقە سەربەرزەکا
گرد گەردوونی گێرۆنە وەر (١٥)
هەزار گوڵزاری خەندەران
جە ڕوجیاریو وەری گەشتەر
جە گەردوونی فراوانتەر
سەر مارا بەر ، (١٧)
بەرمدانێ ، هەتاکو سەر (١٨)

(١) خۆشەویستیمان لە گەردوون فراوانترە •

(٢) ئانا دیما : وا دیمان • هۆرست : هەستا • ئەندێشـەکەی لەم تاکـە هۆنراوەیەی بێسارانی وەرگیراوە :

قیامەت ئاسان بە ڕووی دنیاوە

یاران جە یاران جیا مەباوە

(٣) ئێر کۆتەنۆ : ئاگر کەوتووەتەوە •

(٤) یارشا : یاریان • دوورۆ وست : دوورخستەوە •

(٥) وەرمو چەما تۆریا : خەوی چاوان تۆراوە •

(٦) هەسارە : ئەستێرە •

(٧) مدیۆ : ئەڕوانێتە •

(٨) گرد : هەموو •

(٩) گێرانە : ئەگرنە •

(١٠) مدانە : ئەدەنـە •

(١١) سەرنەوەیۆ : سەرلەنوێ •

(١٢) سەر هور مدا : سەر هەڵئەدەن •

(١٣) ژیوای : ژیان • بۆوە : ئەبێتەوە •

(١٤) فاڕیۆنە : ئەگۆڕێ •

(١٥) گێرۆنە وەر : ئەگرێتەبەر •

(١٦) ڕوجیار : رۆژ • وەر : خۆر •

(١٧) مارابەر : دەردێنن •

(١٨) مدانێ : ئەدەن •

# لە وەڵامی داوایەکدا ..

پایزی ڕابوردوو دەستەی بنووسانی
گۆڤاری ( بەیان )ی دەزگای ڕۆشنبیری و
بلاوکردنەوەی کوردی داوایان لێ
کردم ، وەك داوایان لە گەلێ کەسی تریش
کرد ، چاپەمەنی یەکانی ئەو دەزگایە
بە گۆڤارو کتێبیانەوە ، هەلسەنگێنم و
گفتیشیان دامێ هەرچی ئەڵێم و ئەنووسم
بلاوی کەنەوە . دیارە ئەبێ منیش
تاڕادەیەك بزانم چی ئەڵێم و چی ئەنووسم ،
منیش ئەم وتارەم بونووسین کە تەنها بەشی
هەلسەنگاندنی کتێبەکانیان لێ بلاوکردەوە
ـ لەهاوکاریدا ـ . ئەوی تری بلاونەکرایەوە ،
جا نازانم لەبەر ئەوە بوو کە من لە سنووری
دیاری کراو دەرچووبووم ، یا جێیان نەبوو
بلاوی کەنەوە ، یا لەبەر هۆیەکی تر بوو کە
هێشتا بۆم دەرنەکەوتووە . هەرچۆن بێ
وا خۆم لێرەدا بلاوی ئەکەمەوە ، چونکە
بە شایانی ئەوەی ئەزانم بەرچاوی
خوێندەواران بکەوێ .

**محەمەدی مەلا کریم**

گۆڤاری ( بەیان ) و دوابەدوای ئەو گۆڤاری ( ڕۆشنبیری نوێ ) ، لە بارو دۆخێکا دەرچوون کە پاش داخرانی گۆڤاری ( گەلاوێـژ ) و نەژیانی لە ساڵو نیوێ زیاتری گۆڤاری ( بڵێسە ) و ( ڕۆژی نوێ )ی پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووز ـ لەگەڵ ئەو بەرەو پێش چوونو گەشەکردنـە بەربڵاوەش کە بە درێژاییی ٢٠ ساڵ لە ژیانی کولتووریی میللەتی کوردی عێراقدا ڕووی‌دابوو ـ ڕۆشنبیری کورد مەودایەکی ئەوتۆی لە بەردەمدا نەبوو بتوانێ لە کەلێنی ئەو مەودایەوە ، بە بەخشینو وەرگرتن ، خۆی بە ژیانی کولتووریی ناوچەکەو جیهانەوە ببەستێ •

جارێ ، بەدرێژاییی سـاڵانی ٩٤٩ ـ ٩٥٨ ، واتە لە پاش داخرانی گۆڤاری گەلاوێژەوە ، لە ڕۆژنامەی (ژین)ی هەفتانەی بە چوار لاپەڕەی بچووك بڵاوکراوەو لە گۆڤاری ( هەتاو )ی وەك دەفتەری منالآن شێوەی ( ٢٨ ) لاپەڕەییو مانگی سـێ جـار بـڵاوکراوە بـەولاوە ، کـە بـە هەردوکیشیانەوە هێشتا بەشی جێبەجێ کردنی پێویستی‌یە کولتووری‌یەکانی بەشـێکی زۆر کـەمی کۆمەڵـەی کوردەواری‌یـان نەئـەکرد ، هیـچ مەودایەکی‌تری بڵاوکردنەوە نەبوو • کتێب لەچاپ‌دانیش نە لە تـوانای زوربەی بنووساندا بوو ، نە ئەوەندەشی لێ ئەفرۆشرا کە ئەرکەکـەی خۆی دەربێنێتەوە • لەپاش شۆڕشی ١٤ی تەمووزیش ، هـەرچەند بـۆ ماوەیەك ، گۆڤاری ( بڵێسە ) و ( ڕۆژی نوێ ) و ( نەورۆز ) و (ڕزگاری) بڵاوکرانـەوەو ، ( ژیـن ) و ( هەتـاو ) ەکەی جارانیـش زیـاتر گەشەیان کرد ، ئەوەش ئەوەندەی نەخایاندو ڕۆژانێکی ئەوتۆ بەسـەر کولتووری کورددا هاتن کـە تا دەرچـوونی بڕیاری دانـان بە مافـە کولتووری‌یەکانی گەلی کورددا [ ١٩٦٩ ] باڵی ڕەشـیان بەسـەر ژیانی ڕۆشنبیریماندا کێشابوو • بۆ لێ‌تێ‌گەیشتنی ئەم حاڵە ئەوەندە بەسە کـە

بزانین لە دوادواییی ئەو سەردەمەدا ئەبوو ئەدەبی کورد لە گۆڤارێکی وەك گۆڤاری ( تووتن )دا مەودای گەشەکردنی خۆی وەدەستبێنێو هەناسەیەك بدا •

بۆیە ، دەرچوونی ( بەیان ) لەئەنجامی دەرچوونی بڕیاری مافە کولتووری‌یەکانی گەلی کورددا ، کە هەر لەوسەردەمەدا ڕۆژنامەی ( هاوکاری ) یش دەرچووو پاشتریش ، واتە پاش دەرچوونی بەیانی ١١ی مارت ، گەلێ گۆڤارو ڕۆژنامەی‌تریش دەرچوونو ، دوای ئەوان ( ڕۆشنبیری نوێ ) یش دەرچوو و بزووتنەوەی کتێب لەچاپدانیش گوڕێکی تازەی بەخۆیەوە دی ـ ئەمانە هەموویان ، بە هەنگاوی گەورەو کاریگەرو شوێن پەنجە دار بە ئەدەبو کولتووری کوردی‌یەوە دائەنرێن •

بایەخی گۆڤاری ( بەیان )و ( ڕۆشنبیری نوێ ) ، سەرەڕای ئەوە کە لە بارو دۆخێکا دەرچوون هەموو قەڵەمێکی نیشتمان پەروەرو دیموکراتی کورد مەیدانی نووسینی هەبوو ، کە ئەوەش تێکڕا بۆ لەوەپاش جێ‌پەنجەی خۆی بە هەردوو گۆڤارەکەوە جێ‌هێشت ، لەوەدا دیاری ئەدا کە لە ماوەی ساڵانی پاش ١٩٧٠وە تائێستا گەلێ گۆڤاری‌تری کوردی دەرچووە کە هەریەکە لەبەر هۆیەکی تایبەتیی خۆی کە پێوەندی بە ژیانی گشتی‌یەوە هەیە نەیتوانیوە بەردەوام بێو بژی • هەر ئەمان بوون لەبەر دەوڵەتی‌یەتی‌یەکەیان ـ لە کۆمەڵگایەکا کە ڕێکخراوو سازمانی میللی هەرگیز ئەوەندەی دەور نەبوە بتوانێ بێ‌ترس لە گەردشی ڕۆژگار بژی ـ ماونو ژیاونو هۆی گەشەکردنیان بۆ دابین بووە •

لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا بەسەر لاپەڕەکانی ( بەیان )و

( ڕۆشنبیری نوێ )وە گەلێ بنووسی لاو پێ‌گەیشتووەو ، گەلێ بابەتی نوێ کەوتووەتە ئەدەب‌و کولتووری کوردەوەو ، پێوەندی خوێندەوارانی کورد بە کولتووری دەوروپشت‌و جیهانەوە گەلێ پتەوو بەهێز بووە .

بەڵام هەموو ئەم خاڵە باشانە ، پاساوی ئەو ناتەواوی‌و کەم‌و کورتی‌یانە نادەن کە جارجار ، بەڵکو زۆر جار ، لەم دوو گۆڤارەدا هەستیان پێ ئەکەم‌و پێشتریش زۆر جار لێیان دواوم‌و کەم‌جار مەیدانی بڵاوکردنەوەی دوانەکەم دراوە . وا ئێستاش کە بەڕێوەبەرایەتیی دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاو کردنەوەی کوردی خۆی داوام لێ ئەکا ڕای خۆم دەربڕم ، وەك هەمیشە ، بە سنگێکی گوشادەوە دێمە پێشەوەو ئاواتەخوازی ئەوەم لە پێناوی سوودی کولتووری کوردو خوێندەواری کوردو گەشەکردنی ڕاستەقینەی ئەم گەل‌و نیشتمانەدا کە هەموومان ئەڵێین خزمەتی ئەوانمان مەبەستە ، ئەم تۆزە ڕەخنەیەم لێ بە زۆر نەزانرێ‌و ڕێگای گەیشتنە سەر لاپەڕەی یەکێ لەم دوو گۆڤارەی لێ نەگیرێ .

هەرچی گۆڤاری بەیانە ، وەك گۆڤارێکی ئەدەبی ، کە ئەدەبیش ئاوێنەی ژیانی کۆمەڵایەتی‌یە ، وەك من هەست ئەکەم بەتەواوی لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتیی کوردەواریدا جۆر نی‌یە ، واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتیی کوردستانی تیا ڕەنگ نادانەوە . لایەنگیری‌یەکی زەقی بۆ هەندێ ڕێبازی ئەدەبی‌و بیری‌و ، خۆدوورگرتن‌و دوورەپەرێزیی لە هەندێ ڕێبازی‌تری بەئاشکرا پێوەدیارە . مەیدانی ئەوەی تیا نادرێ هەندێ باری سەرنجی تیا بخرێتەڕوو ، ناهێڵن بەڵگەی بە قسەو بیرو ڕای هەندێ خاوەن‌بیر تیا بهێنرێتەوە ، بەڵکو نابێ تەنانەت ناویشیانی تیا بهێنرێ .. لەکاتێکا کە باری بیری ڕۆشنبیرانی کورد وا نی‌یە ، بەڵکو ئەمە لە گۆڤارە

عەرەبی یەکانی دەوڵەتدا بەو زەقی یە هەست پێ ناکەین ، وەك بڵێین بانێکەو دوو هەوا •• زۆر جار وتار لە بەیاندا بڵاوئەکرێتەوە بێ ئەوەی خوێندرابێتەوەو لێی کوڵرابێتەوە چونکە خاوەنەکەی پێویستی بە پاسپۆرت نی یە ، بەڵام کە وەڵامێکی ئەو وتارە ئەدرێتەوە هەزارو یەك کۆسپە ئەهێنرێتە ڕێی بڵاوکردنەوەی ئەو وەڵامە •• ڕۆشنبیری نوێیش هەر وایە • ئیستا سایکۆلۆژیو سیاسەتو ئابووریو مێژووی بەپێی باری زانا بۆرژواکان تیا بڵاوئەکرێتەوە ، بەڵام بەپێی باری سەرنجی سۆشیالیستەکانی تێدا قەدەغەیە • لەوچەندانەدا یەکێك وتارێکی وەرگێڕراوی تیا بڵاوکردبووەوە لەبارەی ١٦ کتێبەوە کە گوایە « باری مێژوویان گۆڕیوە » کتێبێك لەو کتێبانە « خەباتی من »ی هیتلەرو کتێبێکی تریان « کاپیتاڵ »ی ك • مارکس بوو • باسی کتێبەکەی هیتلەر نە بای دیبوو نە باران بۆخۆی ( معزز مکرما ) بڵاوکرابووەوە ، بەڵام بەشەکەی کاپیتاڵ ـ ئەترسم جارێکی کەش ناوی خاوەنەکەی بنووسم ـ دوو خەتی ڕاستو چەپی بەسەرا هێنرابوو • بەمجۆرە وتار لەبارەی١٦ کتێبەوە بوو ، کەچی باس باسی ١٥ کتێب بوو • باشە ، برادەرینە ، چش لەوە کە من هەر لەبنەڕەتا لەگەڵ وتاریوا نیم کە « کاپیتاڵ »و « خەباتی من » بخاتە یەك تای تەرازووەوەو وادابنێ هەردوو کتێب کاریان کردووەتە سەر مێژوو ، بەڵام توخوا زانینی هەندێ شت لەبارەی « کاپیتاڵ »ەوە حەرامەو مرۆی پێ ئەبێ بە « مارکسیست » ؟ کە پیاو بە باری چاکەدا ڕادیکالی نەبوو ، هیچ نەبێ با تۆزێ مەیدانی لیبرالیزم بدا • وائەزانم وەختی ئەوە هاتووە تۆزێ دەست لەم « حەساسیەت »انە داشۆرین •• بۆ خۆمان چاترە !

باری زمانەوانیی زۆر وتاری هەردوو گۆڤارەکە زۆر لاوازەو پێویستی بە پیاچوونەو ڕاستکردنەوە هەیە ، بەڵام بەمەرجێ بە کەسێ

بسپێررێ که خۆیشی وەك بنووسی وتارەکان نەبێو بزانێ کامە هەڵەیەو چۆنی ڕاستئەکاتەوە • بەڵگەنامەو ئەمری ئیداری لێرەدا دەور نابینێ ، شارەزایی پێویستە •• هەڵەی چاپ ، بێئامان ، زۆرە لە هەردوو گۆڤارەکەدا • ڕاستە بەشێکی زۆری هەڵەی چاپ خەتای بنووسەکان خۆیانە : بە قەڵەمی وشك ئەنووسن کە نوختەی پێ جوێ ناکرێتەوە ، زۆر دەست بە قاقەزەوە ئەگرن وەك بڵێی پەڕەی قاقەز بە سەد فلس بێ ، دێڕ لەسەر دێڕ کەڵەکە ئەکەن ، لەمپەڕ تا ئەوپەڕی قاقەزەکە ڕەشئەکەنەوە ، یەك نوختەو دوو نوختەو سێ نوختە لەیەك جوێناکەنەوە ، گەلێ پیت وەك یەك ئەنووسن ، وشەکان ئەترنجێننە یەك ، کە هەموو ئەمەش ئەبێ بە باری مەینەت بەسەر کرێکاری پیتداڕێژی چاپخانەوە •• وتم ڕاستە بەشێکی زۆری هەڵە خەتای بنووسەکان خۆیانە ، بەڵام هەڵە ڕاستکەرەوەکانی گۆڤارەکانیش زۆر جار لە بابەتی وتارەکان ناگەنو ناتوانن بەگوێرەی مەعنا ڕاستو چەوت لەیەك جوێبکەنەوە ، یا هەر هەست بە هەڵە ناکەن •• بۆ چاری ئەم مەسەلەیە پێویستە لە هەموو ژمارەیەکی هەردوو گۆڤارەکەدا بانگەواز بۆ بنووسان بڵاوبکرێتەوە کە هەر وتارێ واو وا نەنووسرابێ ئەخرێتە پشت گوێ •• هەروا ئەشبێ ڕۆشنبیری شارەزا دانێن بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەی پرۆڤەکان • ناڵێم بەرانبەر بە هەر هەڵەیەك چارەکە دینارێك لە مانگانەکەیان داشکێنن ، بەڵام ئەڵێم پرۆڤەی بەردەستی کامیان بێهەڵەتر لەچاپدرا خەڵاتی بکەن ••

مەسەلەی دەستنیشانکردنی کادری گۆڤارەکانیش ، هەر لە جێنشینی سەرۆکی نووسینەوە بیگرە ، تا ئەگاتە سکرتێری نووسینو لیژنەی هەڵبژاردنی وتارو کادری هونەری ، کارێکیوا نییە بشێ کەمتەرخەمیی تیا بکرێ • ئەبێ سەنگو ترازوو بۆ دەستنیشان کردنی

ئەمانە لێهاتن و دڵسۆزی بۆ وشەی پیرۆزی پێشکەوتخوازی کوردیو
بە چاوی ڕێز ڕوانینە ڕۆشنبیرانی کوردو چاپەمەنیی کوردی بێ •

مەسەلەیەکی کەش هەیە کە مەسەلەی وەرگێڕانە لە عەرەبی‌یەوە •
من لاموایە ئیتر وەختی ئەوە هاتووە ڕادەی ئـەم کارە کەم بـکرێتەوەو
دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی هەندێ ڕۆشنبیری وا لای
خۆی دامەزرێنێ کە زمانە بێگانە زیندووەکان باش بزانن بۆ وەرگێڕان
لێیانەوە ، ئیتر با کوردی‌یش زۆر باش نەزانن ، چونـکە ئەتوانـرێ
چەند کوردی زانێکیش دامەزرێـنرێ بۆ پیـا چوونەوەو داڕشتنـەوەی
بەرهەمی ئەو کەسانە • وەرگێڕان لە عەرەبی‌یەوە ، بە شێوەیەکـی
گشتی ، ئەبێ بۆ دوو جۆرە بابەت بێ • یەکەم : بابەتێ کە خۆی بە
عەرەبی نووسرابێ وەك شاکارەکانی ئەدەبی عەرەبی و بابەتە کولتووری‌یە
عەرەبی‌یەکان • دووهەم : هەواڵ و دەنگ و بـاسی ڕۆژانـە • لاموایـە
پێویستە بیرێکی باش لەم مەسەلەیەش بکرێتەوە •

هەروا گلەییم لەوەش هەیە کە بابەتی زەقی سیاسی‌یش لە هەردوو
گۆڤارەکەدا زیاد لەو ئەندازەیە کە ناچاری‌یەو پێویستە • ئەمـە ئیش و
ئەرکی هیچ کام لەم دوو گۆڤارە نی‌یە • لەوانەیە ئیشی ( هاوکاری ) بێ ،
ئەویش بەڕادەیەك کە تای تەرازووی بابەتەکانی‌تر سووك نەکا ، چونکە
دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی لە بڵاوکردنەوەی کتێـب و
نامیلکەی سیاسیدا هیچ درێغیی نەکردووەو هـێڵی دەستنیشـان کراوی
ڕەسمیی بەوردی جێبەجێ کردووە •

ڕایەکی بەتایبەتی لەبارەی ( ڕۆشنبیری نـوێ )یشەوەم هەیـە •
ئەمەوێ ناڕەزایی لە ڕێبازی ئەم دوو ساڵەی دواییی ئەم گۆڤارەدەربڕم •
وەختی خۆی گوترا ( ڕۆشنبیری نوێ ) ئەکرێ بە گۆڤاری زانستی •

ڕاسته گۆڤاری زانستی به کوردی پێویستەو ئەرکێکی پیرۆزه ، بەلام دەرکردنی گۆڤاری زانستی پێویستی به بنووس یا وەرگێڕیوا هەیه بەر له هەرچی زانای بابەتەکه بێو لێی شارەزا بێ • زیاد لەوه ئەبێ کوردییەکی باشیش بزانێو ئاگای لەو تەقەلایانه بێ که تائێستا دراون بۆ داهێنانی زاراوەی زانستی له کوردیدا • خۆ ئەگەر وەرگێڕ بێ ئەوه ئەبێ زمانه لێوەرگێڕراوەکەش باش بزانێ • بەلام ئەوەی ئێمه لەم دوو ساڵەدا دیمان ئەوەبوو گەلێ وتاری زانستییوا کرا به کوردی وەرگێڕەکانیان نه کوردی باش ئەزانن‌و نه عەرەبیو نه پسپۆڕی بابەتەکەشن • ئەمه ئەبێ به هۆی بلاوکردنەوەی نەخوێندەواری نەك زانست ، زیاد لەوه که ئەبێ به مایەی زایەکردنی پارەو کاتێکی زۆر به بێهووده •

برادەرینه ! ئێوه که هەر سوورن لەسەر ئەم ڕێبازەی ئێستای ( ڕۆشنبیری نوێ ) ، ئەبێ لیژنەیەکی شارەزای زانستییه جۆربەجۆرەکان لەگەڵ کۆمەڵێ شارەزای زمانی کوردی هەڵبژێرن ، وەك چۆن وەختی خۆی بۆ گۆڤاری ( زانیاری ) کراو ، ئەم ئەرکەیان پێ بسپێرن • چەندکەسی شارەزای‌تریشی بابەتی وەرگێڕانیان باش خوێندنەوەو دڵنیا بوون له کەڵك‌و قازانجی ، بۆ دەست‌نیشان بکەن ، ئەگینا ناگەنه هیچ ئەنجامێکی سوودمەندو ، لەمەولاش هەرچی لەم ڕێگایەدا خەرجی‌ئەکەن به دەم ئاویەوه ئەدەن •

بەلام لەبارەی کتێبه لەچاپدراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیرییەوه ئەوه ئاسان نی‌یه بۆم هەڵیان‌سەنگێنم • مەسەلەش ئەوه نی‌یه کامەیان چاك بووەو کامەیان خراپ چونکه کاری بێ‌نەخشەو پلان که پشتی تەنها به ڕێکەوت تیا ببەسترێ ، چاکیشی تیا ڕووئەداو خراپیش •

بۆیە لێرەدا مـن ئەوەم بەبـیردا دێ کـە دەزگـای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی لیژنەیەکی پرسو ڕاوێژکردنی هەبێ پێکهاتبێ لە شارەزایانی خۆیو شارەزایانی دەرەوەی خۆی • ئەم لیژنەیە لەبـەر ڕووناکیی توانای دارایی دەزگاکەو سیاسەتی کولتووریی دەوڵەتـدا ، هەر لە ناوەڕاستی ساڵەوە پلانی ساڵـی داهاتـوو دانـێ : چەنـد بابەت دەستنیشان بکا کە کتێبیان تیا دابنرێو بۆ ئەم مەبەستە تەکلیف لە کەسانی پسپۆڕ بکا • هەروا چەند کتێبێکیش لە چەند بابەتی جیاجیا دیاری بـکا بۆ وەرگێڕانو بۆ ئەم مەبەستەش هەروا تەکلیف لە چەند ڕۆشنبیرێکی لێهاتوو بکا • ئەبێ دەزگاکە شارەزای زمانەوانییشی بۆ پیاچوونەوەی دانراوو وەرگێڕراوی ئەمانە هەبێ • هەروا ئەبێ لە مەیدانی وەرگێڕاندا هەوڵبدرێ تا بکرێ لە زمانی ئەسڵییەوە وەرگێڕرێ • ئەبێ دەست بەرداری ڕێبازی چاوەڕوانیکردنی ڕێکەوت ببین کە ئەمە خوایە بەڵکو یەکێك کتێبێك دانێ یا وەرگێڕێو بیهێنێ بۆمان بۆی بڵاوبکەینەوە •

ئەمەبوو پوختەی بیرو ڕام • جا ئەگەر بەدڵتان بوو ، ئەوە چاکە • ئەگەر بەدڵیشتان نەبوو ،ماڵی قەڵب سەر بە خاوەنیەتی •

---

ڕەببی مووی لێ بێ زمانی ، پەنجەکانی هەڵوەرێ
هەرکەسێ جەننەت بە چەشنی کوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

( حەمدی )

---

# لەپێناوی یەکێتیی نووسەرانی کوردا

**« سەر نووسەر »**

چەند ژمارەیە کردوومانە بە پیشە ، باسێکی ئەو باری نێوان مانو نەمانەی یەکێتیی نووسەرانی کوردو ڕەنگدانەوەی بەسەر گۆڤاری « نووسەری کورد » دا بکەین •

هەروەك لە ژمارەکانی پێشوودا باسمان کردوە ، هەر لە ساڵی ۱۹۸۰ وە کە یاسای دروستبوونی یەکێتیی گشتیی ئەدیبو نووسەرانی عیراق دەرچوو ئێمە لە زۆر چالاکی کەوتین ، چونکە نەمانئەزانی کەی ئەو یاسایە دەهێنرێتەدیو کەی ئەو یەکێتییە دروست دەبێتو کەی ئەو یەکێتییانەیتر کە ئەو یەکێتییە جێیان دەگرێتەوە ناهێڵرێن ؟ •

ئەمە لایەنی چالاکی • هەرچی لایەنی بەدەنگەوەچوونی ئەو یەکێتییە تازەیەشە ، ئەوە هەڵوێستی ئێمە لەو یادداشتەدا دەستنیشان کرا کە دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتیی نووسەرانی کورد بە ئیمزای سەرۆکی یەکێتی لە ڕۆژی ۵/۶/۱۹۸۰ دا بۆ دەستەی خۆئامادەکردنی ئەو یەکێتییە تازەیەی نارد • هەر ئەو یادداشتە بە کردار هەڵوێستی زوربەی زۆری نووسەرانی کوردی دەستنیشان کرد • ئەوەبوو هەر لە سەرەتاوە تا ئەم ڕۆژانەی دوایی لە ئەندامانی یەکێتیی ئێمە ، لە ژمارەی پەنجەی دەستێك کەمترداوای چوونە ناو ئەو یەکێتییە گشتییەیان کردو لە هەموو کوردیش نەگەیشتە ژمارەی پەنجەکانی هەردوو دەست •

بەڵێ ـ ئێمە هەر لە سەرەتاوە مەبەسمان لەم هەڵوێستە سلبیەت نەبووە ، چونکە دەمانزانی کە یەکێتیی نووسەرانی کورد خۆی لەبەر ڕۆشنایی بریاری ژمارە ٤٨٤ ی ڕۆژی ۹/۱۰/۱۹٦۹ ی ئەنجوومەنی سەرکردەییشۆرشدا ، لە ڕۆژی ۹/۲/۱۹۷۰ دا ڕێگەی دامەزراندنی

دڕا • هەر ئەو بڕیارەش ئەوەی تێدایە کە ئەم یەکێتیی نووسەرانی کوردە پاش ئەوەی یەکێتیی نووسەرانی عیراق دروست دەبێت دەبێتە لقی ئەو یەکێتی‌یە • ئێمە هەر لە سەرەتاوە کە یەکێتی‌یەکەمان دامەزراند ئەو ڕاستی‌یەمان دەزانی ، هەرچەندە ئەوساو ئێستاش هەر باوەڕمان وابوو کە یەکێتیی نووسەرانی کورد قەوارەی خۆی هەبێو هاوکاریی بەتین لەگەڵ یەکێتیی نووسەرانی عیراقدا بکات، سوودبەخشترو بەرهەمدارتر دەبێ بۆ هەموو نووسەرانی عیراق ( بە کوردیشەوە ) و بۆ ئەدەبیاتی گەلی عیراقیش ( بە هەموو زمانەکانی‌یەوە ) ، هەرئەمەش وای‌کرد کە کۆششی تایبەتی‌ی سەرۆکی یەکێتیی نووسەرانی کورد ( کە ئەوسا سکرتێری یەکێتی بوو ) ، بەربگرێو پێوەندیی یاسایی ئەم دوو یەکێتی‌یە بەوە ڕێك بخرێت ، کە پێوەندیی ئێمە لەگەڵ دەرەوەی وڵاتدا لەڕێی یەکێتیی نووسەرانی عیراقەوە بێت • بەمچەشنە مادەیەك خرایە پێڕەوی ناوخۆی ئێمەوە کە هێنانەدیی پێوەندی لەگەڵ دەرەوە بەپێی پێڕەوی ناوخۆ لەڕێی یەکێتیی نووسەرانی عیراقەوە دەبێت •

باری سرکردنی یەکێتیی ئێمە لەنێوان ساڵانی ١٩٧٤ ـ ١٩٧٨ داو باری گشتیی یەکێتیی نووسەرانی عیراقیش لای زۆربەی نووسەران دیارە ، بەڵام با بێینەوە سەر باری ئێستا •

وەك وتمان ـ پاش دەرچوونی ئەو یاسایە ، دەستەی خۆئامادەکردنی ئەو یەکێتی‌یە تازەیە ، بێ ئاگاداریی ئێمە کوردێکیان بە نوێنەری نووسەرانی کورد لەناو خۆیاندا دانابوو ، ( خۆ لە دانانی یاساکەشدا هەر پرسمان پێ نەکرابوو ) ، هەروەك بێ ئاگاداریو پرسی ئێمە لە وەفدەکانی دەرەوەی وڵاتدا کوردیان هەڵدەبژارد ( وەك ئەوەی بۆ کۆنگرەی نووسەرانی عەرەب لە عەدەن یەکێکیان لەگەڵ خۆیان بردبوو ) • بەڵام

بەم‌حاڵەوە نەتوانرا نە لە یەکێتیی ئێمەوە نزیك ببنەوەو نە بە بێ یەکێتیش نووسەری کورد ڕووی کردە ئەو دەستەیە • هەر ئەمە وای کرد کە هەڵوێستی ئەو دەستەیە بگۆڕێ‌و مەسەلەش لەلایەن سەرکردایەتیی وولاتەوە قاڵبێکی‌تر بگرێت • ئەوەبوو هەندێ لایەنی بەرپرسیار لە کاری نووسەران ، چەند کۆبوونەوەیەکیان ڕێکخست ، لەوێدا نوینەرانی نووسەرانی عیراق‌و چوار برای کورد بەشدار بوون ، کە یەکێکیان ئەندامی یەکێتیی ئێمەیەو ئەوانی‌تر کاربەدەست‌و لێپرسراون • لەو کۆبوونەوانەدا هەندێك لە بەشداران بە کوردو عەرەبەوە هەڵوێستی ئیجابی‌و لەسەرکردنەوەی خۆیان بەرامبەر بە نووسەرانی کوردو یەکێتییەکەیان پیشان‌داو هەر ئەوانە کەوتنە کۆششی لەیەك نزیك کردنەوەو لەیەك گەیشتن ، یا ڕاستتر ئەوەیە لە ئێمە گەیشتن‌و هەر لەو کۆبوونەوانەشدا گەڵاڵەیەکی ئەوە کرابوو کە یاساکەی یەکێتیی نووسەران بەجۆرێك بگۆڕێت کە شتێکی تایبەتیی تێدا بە نووسەری کورد بدرێت •

پاش ئەمە لە ڕۆژی ٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٨٢دا مامۆستا تاریق عەزیز لەگەڵ چوار ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر ( کە لە بەغدان ) کۆبۆوە ، لەو کۆبوونەوەیەدا سەرۆکی دەستەی خۆئامادەکردنی یەکێتیی ئەدیب‌و نووسەرانی عیراق ( کە پێشتریش دوو جار نوینەرانی ئێمەی لە بەغداو جارێك لە هەولێر دیبوو ) لەگەڵ ئەو ئەندامەی یەکێتی ناو ئەو چوار کەسەی باسمان‌کرد کە کاك عەبدولستار تاهیر شەریفە بەشدار بوون •

لەئەنجامی ئەو کۆبوونەوەیەدا گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە لە ڕێگەی یاساو ڕێگەپێدانەوە ، لە باری ئێستای وولات‌و لە سنووری

لێکدانەوەی ئێستای سەرکردایەتیدا بۆ ئەو بارە ، یەکێتیی نووسەرانی کورد بە سەربەخۆیی نامێنێتەوە • هەرچی بـاری تایبەتـیی نەتەوەیـی نووسەری کوردیشە ئەوە بەگۆڕینی یاساکە ڕەچاو دەکرێتو شتێکیوا دەکرێت کە لەناو ئەو یەکێتییە گشتییەدا نووسەری کورد قەوارەیەکیان هەبێت کە پێکەوەیان بنێتو کۆیان بکاتەوە •

ئێمە پێش چوونە کۆبوونەوە ، ڕەشنووسی گۆڕینێکی یاساکەمان ئامادەکردبوو ، هەروەك موناقەشەی ئەو گەلاڵەیەشمان کرد کە پێشـتر باسمانکرد • لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەمان ڕاگەیاند کـە مەسەلە هـەمووی هەر بەستراوە بە ڕای نووسەرانی کوردەوە ، چونـکە ئێمە نوێنـەری هەڵبژاردەی ئەوانینو هەموو شتێـکی تازە با بیری خۆشمانی لەسـەر بێت هەر دەبێ بیرێتەوە لای ئەوانو داوای ئەوەمـان کرد کە ڕێـگەی کـۆبوونەوەی گشتیی نووسەرانمـان بدەنێ ( کە پێشـــتر ڕێـگەی گیرابـوو ) •

ئەوەبوو لەنێوان ڕەشنووسەکەی ئێمەو ئەو گەلاڵەیەدا شتێـکی تازە بریاردراو یاساکە بەوجۆرە گۆڕرا ، ( کە تێکستەکەی لەم ژمارەیەدا بە عەرەبی دەخوێننەوە )و ڕێگەی کۆبوونەوەشمان دراو تەنانەت میوانداریی بەشدارانی کۆبوونەوەش خرایە سـەر ئەمانەتـی گشـتیی ڕۆشنبیریو لاوان •

ئەوەبوو لە دوو ڕۆژی ١١و ١٢ی کانوونی دووهەمی ١٩٨٣دا لە هەولێر دوو کۆبوونەوەی درێژ کە تێـکڕا دوانزە سەعاتێـکیان خایاند ، سازدرانو لەو کۆبوونەوانەدا نزیکەی ٦٠ نووسەر بەشدار بوون ( کـە ئەمانە زوربەی زۆری ئەو نووسەرانەن کە پێـوەندییـان بـە یەکێتیو چالاکییەکانییەوە هەبووە ، چونکە ئەنـدامی ئـەوتۆش هەیـە کە پاش

بوونه ئەندام هیچ چالاکی‌یەکی نەنوواندووەو ئەندامی ئەوتۆش هەیە کە بەپێی پەیڕەوی ناوخۆو لەبەر ئابوونـە نەدان ئەندامێتی‌ی نەمـاوە ) •
هەروەك نوێنەری دەستەی خۆئامادەکردنی یەکێتی‌ی ئەدیبو نووسەرانی عیراقیش بەشدار بوو •

لە موناقەشەکانی ڕۆژی یەکەمدا ـ ڕایەکـی گشـتی لەلایـەن نووسەرانەوە گەڵاڵە کرا ، ئەویـش ئەوەبوو کـە هەرچەندە بەداخەوە دەڕوانینە نەهێشتنی قەوارەی سەربەخۆی یەکێتی‌ی نووسەرانی کـوردو دامەزراندنەوەی ئەو یەکێتی‌یە بە ئاواتو داخوازی هەمیشەیمان دەزانین •
بەڵام کە ئێستا ئەوەمان دەستنەکەوێت دەبێ بەپیر ئەم هەنگاوە تازەیەوە بچین کە ( گوڕینی یاساکەیە )و پێشنیاری چەند گۆڕینی‌تریش بکەین •
ئەمە ڕای هەموو قسەکەرانی ئەو کۆبوونەوەیە بوو ، لەوێدا تەنیا یەك نووسەر ڕایەکی‌تری هەبوو ـ کە ئەویش یا یەکێتی‌ی سـەربەخۆ یـا نەچوونە ناو یەکێتی‌ی تازەوە بوو ، هەر ئەو تاقـە کەسـە ئـەم ڕایەی دەربڕی‌و چاوەڕێی ئەوەی نەکرد موناقەشە بکرێت ، چووە دەرەوە •

بەمچەشنە لەبەر ڕۆشنایی موناقەشەو پێشنیارەکاندا ، سـەرۆکی یەکێتی‌و جێگری سەرۆك ڕەشنووسی یادداشـتێکیان ئامادەکـرد کە بـۆ سبەینێ بخوێنرێتەوەو دەنگی لەسەر بدرێت • کاتو شوێنی گردبوونەوەو کۆبوونەوە مـاوەی ئەوەی نەئـەدا کە پێـش کۆبوونـەوە گشـتی‌یەکە موناقەشەی ئەو ڕەشنووسە بکرێت ، لەبەرئەوە کـێ فریاکەوتـین لـە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەرو دەستەی گشتی ڕەشنووسەکەمان پیشان‌داو هەندێك ڕاشمان ڕەچاو گرت •

لە سەرەتـای کۆبوونـەوەی ڕۆژی دووەمـدا سـەرۆکی یـەکێتی ڕەشنووسی یادداشتە پێشنیارکراوەکەی خوێندەوەو دەرگای موناقەشەی

کردەوە لەئەنجامدا کەس نەبوو کە لەو یادداشتە ناڕازی بێت ، یا پێشنیاری گۆڕینی بکات ، تەنیا ئەوە نەبێت کە نووسەرێك ڕای ئەوە بوو کە ئەو دێڕەی هێنانەدیی داخوازەکانی ناو یادداشتەکەی تێدا کراوە بە مەرجی هاوکاریی ئێمە لەگەڵ یەکێتیی تازەدا وای لێ بکرێت، کە ئەو هێنانەدییە پێش کۆنگرەی یەکێتیی تازەو پێش‌بوونە ئەندامیی ئێمە بێت لەو یەکێتییەدا ، تاقە نووسەرێکی‌تریش هەستاو ئەو ڕایەی پەسندکرد •

لەئەنجامی موناقەشەدا دەرکەوت کە هەموو لەو یادداشتە ڕازین ، تەنانەت کە سەرۆکی یەکێتی ( سەرۆکی کۆبوونەوە ) لە نووسەری خاوەن‌پێشنیاری پرسی ئایا ئەگەر مەبەسەکانی ناو یادداشتەکە جێبەجێ‌کران تۆ دێیتە ناو ئەو یەکێتییەوە ، وەڵامی بەم‌چەشنە بوو :

— بەڵێ ، کاکە دوکتۆر من ئەو یادداشتە جێبەجێ بکرێ دەبم بە ئەندامی ئەو یەکێتییە تازەیە •

کەواتە تاقە جیاوازی ئەوەبوو ، ئایا هاوکاری نەکردن بەهۆی جێبەجێ‌نەکردنی یادداشتەکەوە بخەینە پێش کۆنگرەی نووسەرانی هەموو عیراق ، یا ناو کۆنگرەو پاش کۆنگرە • ئەوەبوو پێشنیاری ئەو نووسەرە کە ناونرا ( گۆڕین — یا تەعدیل )ی یادداشتەکە ، لەلایەن خاوەن‌و پێشنیارکەری یادداشتەوە ( کە سەرۆکی یەکێتییە ) وەرنەگیرا ، کەواتە بەپێی دەستووری لە هەموو جیهاندا ڕەچاوکراوی کوبوونەوەو بەڕێوەبردنی کوبوونەوە ، یادداشتەکە ( بەبێ‌ئەو گۆڕینە وەرنەگیراوە) دەخرێتە دەنگ‌دانەوە •

ئەنجامی دەنگ‌دان ئەوەبوو زوربەی زۆری نووسەران دەستیان لەگەڵ یادداشتەکەدا بەرزکردەوە • بەڵام لەبەرئەوەی ژمارەیەك ( کە کەم نەبوون ) لەوانەی ئەندامی یەکێتی نین لە هۆڵەکەدا بوون ، سەرۆکی

کۆبـوونەوە وای پێشـنیار کـرد کـە دەنـگدان بـە بانـگ‌کردنی نـاو بێت ، کـە ئەمەش ڕێبازێکـە لە کـۆبوونـەوەی خـوێیو جیهـانیـدا دەبینرێت • بەوچەشـنە ـ ٣٥ نووسـەر لەگـەڵ یادداشـتو ٨ دژو ١٨ بێدەنگ بوون •

پـاش ئەمە خاوەنـی ( گۆڕیـن ) سووربـوو لەسەرئـەوەی کـە گۆڕینەکەی ئەویشـں بخرێتـە دەنگـەوە ، هەرچـەندە دەنگـدان بـۆ یادداشتەکە مانای دەنـگ‌نەدانە بـۆ گۆڕینەکـەی ئەوو تەنانـەت ئەگەر بێدەنگەکانیش دەنگ بۆ ئەو گۆڕینە بـدەن ناگەنـە ٣٥ کـەس • ئەمـە تۆزێ ـ ئەو ئاوو هەوا دیموکراتـیو موناقەشە هێمنانەیـەی گـۆڕی •• لەگەڵ ئەوەشدا سەرلەنوێ باس لەوە کرا کە جێبەجێ‌کردنی یادداشتەکە کاتی ئەوێو هەندێك لە داخوازەکان دەبێ بکرێن بە یاساو هەندێك بـە پێڕەوی ناوخۆو هەندێك بە ڕێبازدانان یا ( تەعلیمـات ) ئەمـەش لەگەڵ خواستی پەلەکردن لە بەستنی کۆنگرەدا ناگونجێو با ئێمە نەبین بە کۆسپ لە بەردەمی ئەو خواستنەدا • ئەوە بوو کاك عەبدولستار تاهیر شەریف پێشنیاری گۆڕینێکی تازەی کرد ، ئەویش ئەوە بوو ، کە داوای ئـەوە بکەین پێش کۆنگرە ئەم داخوازی‌یانە جێبەجێ بکرێن ، ئەگەر جێبەجێ نەکردنی بەهۆی ( پێدا ڕانەگەیشتن ) واتە ( عامل الوقت ) بوو ئـەوا لە کۆنگرەدا جێبەجێ بکرێن •

سـەرۆکی کۆبوونەوە ، بۆ پاراسـتنی یەکێتی‌ی دەنـگ ، داوای ئەوەی کرد کە دەنگ بۆ ئـەوە بدرێت ، ئایـا ئـەم پێشنیارە بخرێتـەوە دەنگدانەوە یا نا ؟ ( چونکە دەنگ بۆ یادداشتەکە درابوو ) ، کە هەموو لەگەڵ ئەوەدا بوون دەنگ بدرێتەوە ، ئەم (گۆڕین) ە خرایە دەنگدانەوەو دەستی زوربەی زۆر لەگەڵبـدا بەرزبـۆوەو کە ووتـرا ( دژ )و ووترا ( بێدەنگ ) کەس دەستی بەرزنەکردەوە •

بەم‌چەشنە کە هاتینەوە بەغدا یادداشتەکەمان پێشکەش کرد [ تێکستی یادداشتەکە لەم ژمارەیەدا بڵاوکراوەتەوە ] • پاش چەند ڕۆژێك دەستەی خۆئامادەکەرو هەندێك لێپرسراوی باڵا ئاگاداریان کردین کە هیچ ناڕەزایی‌یەکیان لە یادداشتەکە نی‌یەو هەمووی جێ‌بەجێ دەکرێت • ئێمەش ئەمەمان بە ئەندامانو لقەکانی یەکێتی ڕاگەیاند • پاش چەند ڕۆژێك سەروکی لقی یەکێتی‌ی ( هەولێرو سلیمانی ) پێیان ڕاگەیاندین کە لای نووسەران وایە ئەو وادەی بەجێ‌هێنانە بە نووسین بێت • هەرچەندە ئێمە ئەم‌داوایەمان لا باش نەبوو و ( لای ئێمە پاش گەز بوونەوە لە قسەو نووسین ، یا جێ‌بەجێ‌کردنی وادەی دەمی‌و نووسین ڕەنگە جیاوازیی ئەوتۆی نەبێت ) ، لەگەڵ ئەوەشدا یادداشتێکی نووسراومان بەم‌مانایە پێشکەش‌کرد [ تێکستی ئەم یادداشتەش لەم ژمارەیەدا بڵاوکراوەتەوە ] • هەرچەندە دەنگدانەوەی ئەم داواو یادداشتە زۆر باش نەبوو ، بەڵام سەرۆکی یەکێتی ، چ لەو یەکتر بینینانەدا لەگەڵ نوینەرانی نووسەرانی عیراق‌و چ لە کۆبوونەوەکانی خۆماندا ، هەمیشە بە ناوی خۆی‌و زوربەی دەستەی بەرێوەبەرەوە ئەوەی دووبارە کردۆتەوە ، کە ڕای ئەوان لە ئەنجامدا لەگەڵ زوربەی نووسەراندایەو ئەمەش لەو ڕاستی‌یە ناگۆڕێت کە ئەوان ڕای تایبەتی‌ی خویان هەیەو دەبێ هەشبێت ، چونکە مەسەلە لێرەدا دروست‌بوونی یەکێتی‌یەکی نووسەرانە ، ئەم چەشنە یەکێتی‌یە ئەگەر زوربەی نووسەرانی تێدا نەبن ، ئەوا نابێت بە یەکێتی‌ی نووسەران ـ با فەرزبکەین زوربەکە لە هەڵویستدا هەڵە بێت‌و کەمەکە ڕاست بێت •

ئەنجام ، ئەوەبوو سەرۆکی دەستەی خۆئامادەکردن ، پاش وەرگرتنی ڕای لێپرسراوان ئەو نامەیەی بۆ نووسین ( کە تێکستی ئەویش لەپاڵ یادداشتەکاندا بە عەرەبی دەبینن ) • بەڵام ئەوەندەشی ووت : کە

بەشکم ئەمە دووا بیانوو بێت‌و ئیتر ڕێکو ڕەوان لەگەڵماندا بدوێن • کە کار گەیشتە ئەم پلەیە سەرۆکی یەکێتی‌ی‌و جێگری سەرۆك ڕوویان‌کردە کوردستان ، بۆ ئەوەی داوا لە نووسەران بکەن کە ناوەڕۆکی ئەو یادداشتە بەجێ‌بهێنن کە خۆیان دەنگیان بۆ داوە •

سەرەتا چووینە سلیمانی، ئێوارەی ١٩٨٣/٢/٢٥ لەگەڵ دەستەی بەڕێوەبەری لقدا کۆبووینەوە ( بەئامادەیی چەند نووسەری‌تریش کە کە لە بارەگاکە بوون ، کە هەندێکیان هەر لە دامەزراندنی یەکێتی‌یەوە نە بارەگایان دیوەو نە لە چالاکی‌ی یەکێتیدا بەشدار بوون ، تەنانەت هیی‌وایشیان تێدابوو ڕەنگە بیست‌و پێنج ساڵیش بێت تیپێکی ئەدەبیی نەنووسیبێ ) • هەرچەندمان کردو کۆشامان ، دوو ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرمان بۆ نەهێنرایە سەر ئەو ڕایە کە بەدەم ئەم هەنگاوە تازەیەوە بچین ، ئەمە هەرچەندە یەکێکیان خۆی خاوەنی پێشنیاری کۆبوونەوەی هەولێر بوو ، ئەوانەی لەگەڵیشیدا بوون ، لە هەولێر لەگەڵ ئەو تاقە نووسەرە نەبوون کە مانەوەی یەکێتی‌ی نووسەرانی کورد یا هیچ‌نەبوونی دەویست ، کەچی ئەمجارە ئەم زۆر گەرمتر هاتبووە سەر ڕاکەی ئەو • لێرەدا ئیتر ناچاربووین هەموو نووسەران بانگ‌بکەین بۆ کۆبوونەوە• ئەوەبوو ڕۆژی دوایی لە هۆڵی یانەی ئەزمڕ کۆبووینەوە • نزیکەی ٦٠ نووسەر ئامادەبوون • ڕای زوربەی زۆر لەسەر ئەوەبوو کە ئێمە لەسەر یادداشتی خۆمان سوورین‌و دەچینە ناو یەکێتی‌ی تازەوەو ( لقی یەکێتی‌ی نووسەرانی کورد ) دروست‌دەکەین‌و داوای بەجێ‌هێنانی یادداشتەکەمان دەکەین‌و دروست‌بوونەوەی یەکێتی‌ی خۆشمانمان لا مەبەستەو هەوڵ ئەدەین ، لە سنووری ئەم قەوارە تازەیەشدا بزووتنەوەی ئەدەبی بخەینەوە جووڵان • بەڵام بەشە کەمەکەو یەکێك لەو نووسەرانەی کە لە ژیانی سیانزە ساڵەی یەکێتیدا نەماندیووە ) ، چوونەوە سەر ڕای

ئەو تاقە برایەی لە هەولێر لە کۆبوونەوە چووە دەرەوە •

بەرامبەر بەم ئەنجامە بڕیارماندا کە ئیستیمارەی بوونە ئەندامی یەکێتیی تازە دابەش کەین و هەرکەس بۆ خۆی سەربەست بێت • ئەوەبوو هەر لە کۆبوونەوەکەدا بەشی زۆر لەگەڵ داواکردندا بوو و بەرە بەرە زوربەی زۆری نووسەرانی سلێمانی داوای بوونە ئەندامیان کردو هەرچی هەولێریشە پێش چوونی ئێمە زۆربەی نووسەرانی داوایان کردبو• هەر لە سلیمانیشەوە کە ڕوومان کردە دهۆك ڕای هەموو نووسەرانی دهۆك ئەوەبوو کە ئەوان لەگەڵ دەستەی بەڕێوەبەرو زۆربەی نووسەرانی کوردن و هەموو داوای بوونە ئەندامی ئەو یەکێتییە تازەیان کرد •

جا ئێستا باری یەکێتییەکەمان ئەوەیە ، کە بە بڕیاری زۆربەی زۆری نووسەرانی کورد بووینە ئەندامی ئەو یەکێتییە تازەیە ، کە تا نووسینی ئەم ووتەیە نزیکەی ١٦٠ نووسەری کوردی تێدایە • ئەو نووسەرە کوردانەش کە هێشتا ئەو بڕیارەیان نەداوە زۆر کەمن و هەندێکیان هەر بە تێکڕایی لەگەڵ چالاکی بە کۆمەڵدا نین و یا ئەندامی یەکێتیی نووسەرانی کورد نەبوون یا هەر کە بوونە ئەندام هیچ چالاکییان نەنواندووەو تەنانەت ساڵەهای ساڵ پارەی ئابوونەشیان نەداوە •

بێگومان وەنەبێ ئێمە ئەم ئەنجامەمان ویستبێ یا لامان خۆش بووبێ ، بەڵکو ئێمەی نووسەری کورد هەمیشە لە هەموو یەکتر بینین و لە هەموو کۆبوونەوەکانیشدا سەرۆکی یەکێتی بە زمانی ئێمەوە ئەوەی ووتووە کە قانزاجی هەموو نووسەران و ئەدەب و یەکێتیی نیشتمانی لە بوونی یەکێتیی نووسەرانی کوردایەو قانزاجی باڵای وڵاتیش لەوەدایە ئەو یەکێتییە نووسەرانی کوردی لاکانی تری کوردستانیش لە خۆی کۆبکاتەوە • بەڵام کە بەرامبەر بەمە ڕایەکی تر هەبێت ، ئەوا نامانەوێ سلبی بین ، بەڵکو دەمانەوێ ئەو لقەی « یەکێتیی نووسەران کورد » و لقەکانی سلیمانی و

هەولێرو دهۆکی ئەو لقەو ئەو دەرفەتانەی تریش کە دەدرێن لەو یەکێتی یە تازەیەدا بە نووسەری کورد ، بکەین بە شتێکی ڕاستەقینەو قەوارەیەکی ئەوتۆ کە خزمەتی گەلی کوردو ئەدەبیاتی کوردیو یەکێتی ی نیشتمانی بکاتو لە گەشەپێدانی ئەدەبیاتی کوردیدا ڕۆڵی بێتو نەبێت بە قەوارەیەکی بەتاڵی ئەوتۆ کە پێچەوانەی ئەم مەبەسانەشی لەباردا بێت .

دیارە هەمیشە ئەوەشمان لەبیر نەچۆتەوە کە ئەمە ڕێکخراوەیەکی ئەدەبی یەو نووسەران یەکدەخاتو ئەرکی سنووورداری هەیەو کالآی لەقەد بالآیەتیو ئەگەر پێی بکرێت تەوژمێك بدات بە چالاکی ی نووسینو نووسەران ئەوە شانازی یەکی گەورەیەو بەردەوامی ی مێژووی پڕ لە شانازیی یەکێتی ی نووسەرانی کوردە لە هەلو مەرجێکی تازەدا . خۆ ئەگەر ئەوەشمان بۆ نەکرا ، ئەوا ڕەنگە هەر بڵێین پێکەوەبوونمان مایەی چارەسەرکردنی هەڵەو هەنگاوی تازەنانە ، هەرچی جیابوونەوەو دووکەرتکردنی ڕیزی نووسەرانی کوردیشە ( کە تائێستا یەك بوون ) ، ئەوە نە قانزاجی تێدایەو نە لەباریدا هەیە هەڵەی بۆ چاكبکریتو نە دەرفەتیش بە چەند کەسی کەم دەدات بەتەنیا خزمەت بکەنو هەڵوێستیان هەبێت .

هیوادارین ، کە کەس لەم یەکگرتنە دووانەکەوێو پشت بە باوەڕو یەكهەڵویستی ی خۆمان ، چاوەڕێی کۆنگرەی نووسەرانی عیراقین ، تا قۆڵی لێ هەڵکەینو بە بیرو هەڵویستی مەردانەی نووسەران درێژە بە مێژووی پڕ شانازیی نووسەرانو یەکێتی یەکەیان بدەین .

« سەر نووسەر »

# قانون تعديل قانون الاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي

« صورة قرار مجلس قيادة الثورة رقم ١٥٥٣ في ١٩٨٢/١٢/٩ »

استنادا الى احكام الفقرة ( ا ) من المادة الثانية والاربعين من الدستور المؤقت قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتأريخ ٩ - ١٢ - ١٩٨٢ اصدار القانون الاتي :-

**رقم ( ١٢١ ) لسنة ١٩٨٢**

**قانــون**

**تعديل قانون الاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي**

**رقم ( ٧٠ ) لسنة ١٩٨٠**

**المادة الاولى**

تضاف الفقرتان التاليتان الى نهاية المادة ( ١ ) من القانون رقم ( ٧٠ ) لسنة ١٩٨٠ :-

خامسا - يؤسس الاتحاد فرعا له في منطقة الحكم الذاتي يسمى ( الاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي - فرع الادباء والكتاب الاكراد لمنطقة الحكم الذاتي ) ويكون مركزه في مدينة اربيل • وله ان يؤسس فروعا له في محافظات الحكم الذاتي وفقا لاحكام هذا القانون والنظام الداخلي للاتحاد وطبقا للتعليمات التي تصدر بمقتضى اي منهما •

سادسا ـ يحق للادباء والكتاب الاكراد المقيمين خارج منطقة الحكم الذاتي الانضمام لاى فرع من فروع الاتحاد لمنطقة الحكم حسب مسقط رأسه او سكنه الاصلي .

**المادة الثانية**

ينفذ هذا القانون من تأريخ نشره في الجريدة الرسمية .

**صدام حسين**
رئيس مجلس قيادة الثورة

**الاسباب الموجبة**

حيث ان قانون الاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي رقم ( ٧٠ ) لسنة ١٩٨٠ لم يتضمن نصا صريحا في فتح فرع للاتحاد المذكور في منطقة الحكم الذاتي .

فقد شرع هذا القانون .

# رسالة

## الى الهيأة التأسيسية للاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي

الاخوة رئيس وأعضاء الهيئة التأسيسية للاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي ـ المحترمين .

تحية الزمالة الادبية . .

وبعد ، فنحن المجتمعين من أعضاء الهيئة العامة لاتحاد الادباء الاكراد ، التقينا في أربيل بتأريخ ١١ و ١٢ ـ ١ ـ ١٩٨٣ بدعوة من رئيس

اتحادنا الدكتور عزالدين مصطفى رسول لعقد ندوة نستمع فيها الى شروح عن التعديل الذي أدخل على قانون الاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي بموجب قرار مجلس قيادة الثورة المرقم ١٥٥٣ والمؤرخ في ٩-١٢-١٩٨٢ ، بناء على اتفاق جرى بين أعضاء الهيئة الادارية لاتحادنا الموجودين في بغداد مع رئيس الهيئة التأسيسية لاتحادكم • وقد حضر الندوة مشكورا الاخ عبد الامير معلة من أعضاء الهيئة التأسيسية • وقد استمعنا في الندوة الى رئيس اتحادنا الذي شرح بالتفصيل كل ما جرى فيما يتعلق بالقانون المذكور وتعديله منذ تشريع الاول وحتى ما بعد تشريع الثاني • كما استمعنا الى الشروح التي أفاض فيها الاخ عبدالامير معلة •

وقد جرى نقاش حي وحوار ديمقراطي أخوي مفتوح ناقشنا فيه بعضنا كما ناقشنا فيه الاخ عبدالامير معلة ، وأجاب هو باسهاب عن كل ما بدا للزملاء أن يعترضوا عليه أو يستفسروا بشأنه •

أيها الاخوة !

اننا نود في هذه الرسالة أن نسجل من جديد ، كما ورد في مذكرة الهيئة الادارية لاتحادنا المرفوعة اليكم في أواسط ١٩٨٠ اعتزازنا باتحادنا الذي ولد كمحصلة طبيعية لنضال شعبنا الكردي والحاجة الماسة التي شعر بها مثقفوه منذ الايام الاولى لثورة الرابع عشر من تموز ١٩٥٨ وكانت اجازة تأسيسه بعد صدور قرار مجلس قيادة الثورة الموقر بشأن الحقوق الثقافية القومية الكردية وكواحد من الاعمال التي مهد بها لبيان الحادي عشر من اذار ١٩٧٠ • لقد سار اتحادنا منذ ذلك الحين في مد وجزر وفق الظروف التي عاشها شعبنا الكردي ، ولكنه كان دائما في خضم المعركة الادبية التقدمية التي خاضها ويخوضها مثقفو قطرنا الواعون ، فكان بحق منبرا للنضال ضد الاستعمار والرجعية والصهيونية وفي سبيل الوحدة

الوطنية والاخوة العربية الكردية ومن أجل تعزيز وتطوير الثقافة القومية لشعبنا الكردي •

اننا لا نريد أن نعيد الى الاذهان ما لاقاه اتحادنا من عنت ، مع مزيد الاسف ، من البعض ، ولكننا نرى لزاما علينا أن نذكر أنه رغم كل ما عاناه ، فقد واصل عقد مؤتمراته العامة ومهرجاناته الشعرية وملتقياته وندواته القصصية والادبية ، واستمر بشق الانفس في اصدار مجلته ولو مرة أو مرتين في السنة ، وأسهم بقسطه في نشر المطبوعات الكردية ، وكان له الشرف العظيم في اصدار الاعمال الشعرية الكاملة لشاعرنا الخالد عبدالله گوران قبل سنتين وفي عشرين الف نسخة •

من هنا ، فان من حق كل أديب كردي حريص على قيم الشعب والادب والتقدم والنضال أن يعتز كل الاعتزاز باتحادنا اتحاد الادباء الاكراد ، ويضعه في مكان الصدارة من ضميره الحي النابض بحب الشعب والوطن والتقدم الاجتماعي والادب النضالي • ونحن نرى أن ابقاء الكيان التنظيمي لاتحادنا والبحث الجاد عن سبل تعزيز التلاقي الذي وجد أساسه في النضال المشترك بين شعبينا العربي والكردي منذ أن وحد بينهما الدين والجوار وتعزز اكثر فيما بعد عندما ابتلي العراق بالاستعمار الحديث والرجعية العميلة وانتشرت أفكار النضال المشترك في سبيل الخلاص من المستعمر وسلوك طريق التقدم الاجتماعي ، تعزيز التلاقي المشار اليه بين أدبائنا أيضا من خلال سبل عملية تكفل لنا اشباع الجميع بالاحساس بخصوصيتهم القومية ، وتبني علائقنا الادبية على أسس أكثر رصانة من شكليات النصوص •

ولكننا ومع هذا الاعتزاز الكبير باتحادنا ومع هذا التصور الذي عرضناه للحصول على الوحدة الحقيقية بين أدباء القطر ، نرى من واجبنا

أن نبحث دائما عما يوحد وليس عما يمكن أن يخلق ثغرات ويضع بذور تفرقة • واذا كان التوجه العام في قطرنا اليوم باتجاه تصور الشكل الجديد لتكوين المنظمات المهنية والفئوية ومنها تنظيم الادباء والكتاب ، فاننا نربأ بأنفسنا عن أن نغدو عقبة في طريق خوض هذه التجربة التي نتمنى لها من صميم نفوسنا أن تتكلل بالنجاح بان تضمن لنا ما نطمح اليه من تطوير لثقافتنا وأدبنا القومي في ظل وحدة وطنية حقيقية وأخوة صادقة وتكفل ازالة ما قد يعلق ببعض النفوس من حساسيات وشكوك •

اننا سنخوض معكم ، ايها الاخوة ، غمار هذه التجربة ، وسنكون ، كما كنا دوما ، صادقين في خوضه ، حريصين على انجاح التجربة ، حريصين على أن لا نكون في موضع الملامة والعتاب من أبناء شعبنا الكردي ، وعلى أن نكون أوفياء ، لتطور الادب العربي التقدمي في العراق كذلك ، حرصنا على أدبنا القومي التقدمي •

ومع أننا نخوض معكم بصدق واخلاص ، أيها الاخوة ، هذه التجربة ، فاننا نعود لنؤكد انطلاقا من ضرورة الصدق وابداء القناعة الذاتية ، أن صيغة وجود اتحاد مستقل للادباء الاكراد هي الصيغة الفضلى في الشروط الراهنة والى حين من الزمن ، لبناء وحدة الادباء في قطرنا العراقي شريطة البحث الجاد والعلاقات المتبادلة بين اتحادكم واتحاد الادباء الاكراد • ان الصيغة الجديدة التي سنخوض تجربتها معكم هي دون طموحنا بكل تأكيد • ولذلك فاننا لنأمل أن تعيدوا النظر في واقعنا ، وأن تتوصلوا ، كما نحن نعتقد ، الى ان الصيغة المثلى في الشروط الراهنة ، هي صيغة وجود تنظيمين مستقلين أو أكثر للادباء في هذا القطر •

اننا نرى أن واقع شعبنا الكردي الذي تراكمت عليه مساوىء القرون والذي يعاني من الحاجة الى مواكبة العصر واللحاق بركب الشعوب

الناهضة اضعاف ما يعانيه بعض الشعوب الاخرى ، يفرض علينا الاستفادة من أي فرصة حقيقية للتقدم مهما ضؤلت • واننا نريد أن لا تكون هـذه التجربة ضئيلة بأي حال، وأن تجعل هذه التجربة من هذا اليوم يوما يشار اليه دائما في تاريخ الوحدة الوطنية والاخوة العربيـة الكرديـة ، وليس كيوم نهيل فيه التراب على مثوى وحيد عزيز علينـا ولد حين ولد بعـد مخاض عسير وعانى في حياته البؤس والحرمان وشظف العيش ومات وهو ما يزال في ريعان الصبا •

وتبقى لنا مع هذا طلبات وملاحظات سنصوغها في اطـارها الصحيـح لنعرضها عليكم قبل عقد المؤتمر العام المقبل للاتحاد بقصد تلافيها • ولكننا نود أن نشير هنا على سبيل التأكيد على ضرورة حذف القيد المتعلق بالمسكن ومسقط الرأس من تعديل القانون بحيث يتاح لكل أديب كردي حيثما كان من وطننا العراقي الانتماء الى فرع الاتحاد في منطقة الحكم الذاتي لكردستان والنص في القانون على وجود نائب أول كردي للامين العام وسبعة أكراد في مكتب السكرتارية تنتخبهم الهيئة العامة لفرع منطقة الحكم الذاتي لكردستان ونسبة منتخبة مماثلة كذلك للمجلس المركزي ، والى وضع ما يشـير الى أخوة الشعبين العربي والكردي اينما ورد ذكر الاخوة العرب في القانون • واننا نطالب باجراء التعديلات المقترحة في هذه الرسالة قبل عقد المؤتمر العام للادباء والكتاب في القطر • وفي حالة عدم اجرائه بسبب عامل الوقت ، ففي المؤتمر • اما في حالة رفض اجراء التعديلات ، فاننا لا نرضى لانفسنا بعضوية الاتحاد ، لانه لا يحقـق في هـذه الحالة الحـد الادنى لطمـوحات الاديب الكـردي •

اننا ننطلق ، أيها الاخوة ، في هذا الطلب المشروع من حرصنا على أن نزيل من طريق التجربة كل عائق أو ثغرة • واننا لنأمل مساعدة كل الادباء

التقدميين في الاتحاد العام المؤمنين بوحدة مصالح الشعوب واخائها الواقعي ، بأن ينهضوا بواجبهم الذي يمليه عليهم ضميرهم التقدمي ، بعيدا عن كل حساسية وسوء فهم ، لمساعدة شعبنا على أن يستفيد حقا من هذه التجربة ، لئلا تكون حصيلته من ورائها في النهاية الخيبة والمرارة •

وختاما نأمل أن نبقى جميعا حريصين على التمسك بمسؤولية الادب والتزامه الهادف بقضايا الشعب والانسان ، وأن نكون دائما في مستوى الرسالة •

والسلام عليكم •

**الادباء الاكراد المجتمعون في أربيل**
**لبحث موضوع تعديل قانون الاتحاد العام**
**للادباء والكتاب في القطر**
**ووضع الادباء الاكراد في الاتحاد المذكور**
**١٢-١-١٩٨٣**

## رسالة موجهة الى الهيأة التأسيسية للاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي

الاخوان رئيس واعضاء الهيأة التأسيسية للاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر ـ المحترمين •

تحية طيبة

وبعد ، فقد سبق ـ كما تعلمون ـ أن أقر المشتركون في اجتماع الهيأة العامة لاعضاء اتحاد الادباء الاكراد بتاريخ ١٢ ـ ١ ـ ١٩٨٣ في أربيل الانضمام الى الاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر واشترطوا لذلك تحقيق بعض الشروط دون أن يشترطوا تحقيقها قبل عملية الانضمام •

وبناء على الجواب الذي تلقيناه من خلال الاخوين عبدالستار طاهر شريف وعبدالامير معله ومفاده أن المسؤولين موافقون مبدئيا على ما ورد في رسالتنا وان لجنة تشكل لدراسة ما يمكن ادخاله منها ضمن القانون وما يمكن ادخاله ضمن النظام الداخلي ، فقد أبلغنا اخواننا في الفروع بذلك ، غير أننا تلقينا من فرعي الاتحاد في السليمانية واربيل اعلاما بأن الرأي السائد لدى الاعضاء هناك أنهم لن يقدموا طلبات الانتماء ما لم يتلقوا وعدا تحريريا بتحقيق الشروط ، ولم تؤد جهودنا الرامية الى اقناعهم بتنفيذ ما اتفقنا عليه في اجتماع أربيل والتصرف فيما بعد في ضوء ما يسفر عنه الوضع قبل عقد المؤتمر العام للاتحاد او داخله •

ولذلك فاننا نود اعلامكم بأنه اذا كان بامكانكم اعلام اتحادنا في بغداد أو فروعه في اربيل والسليمانية ودهوك مباشرة بصورة تحريرية بأنكم الى جانب تحقيق تلك الشروط ، فان ذلك سيسهل عملية انضمام الاخوان وحضورهم في المؤتمر ، والا فاننا نرجو اعفاءنا عن الموضوع واعتبار ما جرى كأن لم يكن للاعداد للمؤتمر ، وتهيئة قائمة أعضاء المجلس المركزي كما يتراءى لكم ودون اشراكنا نحن • واننا نرجو لكم النجاح والتوفيق في خدمة الشعب والوطن والادب التقدمي •

وتقبلوا تحياتنا وتقديرنا •

**الدكتور عزالدين مصطفى رسول**

رئيس اتحاد الادباء الاكراد

رئيس الهيئة الادارية للاتحاد

١٩٨٣/٢/١٠

# جــواب الهيأة التاسيسية
# للاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي
# الى الادبـــاء الاكراد

الاخوة الادباء الاكراد المحترمون

تحية أخوية

وبعد فقد تم الاطلاع على المذكرة المقدمة الى الهيأة التأسيسية للاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي والتي صدرت عن الندوة التي عقدت في اربيل مركز الحكم الذاتي وحضرها السيد عبدالامير معلة ممثلا عن الهيأة التأسيسية للاتحاد وتمت دراسة المذكرة المشار اليها في أعلاه حيث تقرر ان يتم طرح كل ما جرى ذكره من توصيات امام المؤتمر العام للاتحاد لكـي تتخذ تلك التوصيات صيغة اجماع المؤتمر العام ومن ثم تتخـذ الاجراءات لتنفيذها كل وفق ما يتطلبه من اجراء على شكل تعديل للقانون أم تضمين في النظام الداخلي للاتحاد أم على شكل تعليمات داخلية ••

وتقبلوا من الهيأة التأسيسية وافر التقدير •••

**شفيق الكمالي**
رئيس الهيـأة التاسيسية
للاتحاد العام للادباء والكتاب
في القطر العراقى

# پێرست